# ڕێگامان تەوحیدە

## سەرەتایەک بۆ فێربوونی تەوحید




زينبة الكردية

# بسم الله الرحمن الرحيم

## پێشەکی

**الحمد لله رب العالمين والصلاة والسلام على خاتم الأنبياء والمرسلين، اللهم طهر قلوبنا من الشبهات والشهوات وأعمالنا من الرياء يا رب العالمين أما بعد: -**

**پێشەکیەکە دەست پێدەکەم - بەچەند دێرێک لەسەرکتێبەکەم**

**بەرێزان ئەم کتێبەی بەردەستان - باس دەکات عقیدەی موحدان**

**کەزۆرێک خەڵکی لێی بێ ئاگان - بەکاری دونیاوە گرنگی نادەن پێیان**

**لەکاتێکدا هەموومان پێویستمانە - بەفێربوونی ئەم تەوحیدە جوانە**

**باش بزانە بەزانستی تەوحید - الله لێت نزیک ئەبێتەوە بەتەئکید**

**دەی کەواتە هەوڵی بۆ بدە - بۆ فێربوونی هەموو رێگایەک ببڕە**

**بەجوانی تێڕامانەوە - بابەتەکان بخوێنەرەوە**

**کردەوەی پێبکە بە إخلاصەوە - الله یارمەتیت ئەدا دڵنیابە لەوە**

**لەبیرنەکەی بانگەوازی بۆ بکە - خەڵکی لەم تەوحیدە شارەزا بکە**

**چاکەکەی نەبڕاوەیە هەر دەنوسرێت - بەردەوام و بەردەوام تاقیامەت دێت**

**بۆیە باخۆمان لێ بێ بەش نەکەین - لەدوای خۆمان خەڵکیش فێرکەین**

**داواکارم لە الله ربُّ العرشِ العظیم - قبوڵی کات ئەم کتێبە بە فەزڵی کریم**

# بەشی یەکەم

## باسی یەکەم | تەوحید چیە؟

**محمد بن عبد الوهاب لەپێناسەی تەوحید دەفەرمووێت: ( هو إفراد الله بما يختص به من الربوبية والألوهية والأسماء والصفات )**

**واتە: بریتیە لەبەتاك زانینی اللە تعالی لە هەموو شتێك كە تایبەتە بە ئەو و شایەن بە ئەوە { پەرستنی اللە بەتەنها }**

**کە ئەوەی تایبەتی اللە تعالی یەو شایەنیەتی سێ شتە:**

**1- عیبادەتەکان : وەك مەزنی و خۆشەویستی و زەلیلی و ملکەچی و هانابردن.**

**2- پەروەرردگارێتی : وەك دروستکردن و بەخشین و ڕزق و ڕۆزی و بەڕێوەبردن و مردن و ژیان.**

**3- جێگیرکردنی سیفاتە بەرز و تەواوەکانی اللە تعالی کە تەنیا تایبەتە بە ئەو، وە پاکراگرتنی لە هەموو کەم و کوڕیەك.**

**مەبەست لێرە جۆرەکانیەتی، بە ئیزنی اللە لەبەشی دووەم بەجوانی ڕوونی دەکەینەوە.**

- وشەی تەوحید لە قورئان و فەرموودەدا هاتووە :

1- الله تعالى دەفەرمووێت : { وَإِلَـٰهُكُمْ إِلَـٰهٌ وَاحِدٌ } [ البقرة : ١٦٣ ]

واتە : پەروەردگاری ئێوە پەروەردگارێکی تاك و تەنهایە.

ئیمامی بەغەوی لەتەفسیری ئەمەدا دەفەرمووێت: { سبب نزول هذه الآية أن كفار قريش قالوا يا محمد صف لنا ربك وانسبه فأنزل الله تعالى هذه الآية وسورة الإخلاص، والواحد الذي لا نظير له ولا شريك له }

واتە: هۆکاری دابەزینی ئەم ئایەتە ئەوە بوو کە کافرانی قورەیش وتیان ئەی محمد وەسفی پەروەردگاری خۆت بکە بۆمان وە ڕەچەڵەکەیشی. دیار بکە، جا الله تعالى ئەم ئایەتەو سورەتی ئیخلاصی دابەزاند، هەروەها یەك و تەنها کە هیچ هاوشێوە و هاوبەشێکی نیە.

وە هەروەها دەفەرمووێت : { قُلْ إِنَّمَا هُوَ إِلَـٰهٌ وَاحِدٌ وَإِنَّنِي بَرِيءٌ مِّمَّا تُشْرِكُونَ } [ الأنعام : ١٩ ]

واتە : بڵێ: بەڕاستی ئەو پەروەردگارە زاتێکی تاک و تەنهایە و من بەڕاستی بەریم لە هەموو ئەو شتانەی کە ئێوە دەیانکەنە هاوەڵ و هاوتای ئەو زاتە.

هەروەها یەکێك لەناوەکانی الله تعالى ( الواحد ، الفرد الأحد )

2- پێغەمبەر ( ﷺ ) بە عمرو ( رضي الله عنه ) فەرمووی : {ئەگەر باوکت دانی بەتەوحید بنایەو تۆش ڕۆژوو و خێرت بۆی بکردایە ئەوا سودی دەبوو بۆی} رواه أحمد.

## باسی دووەم | بۆچی تەوحید گرنگە ؟

دوای ئەوەی کە باسی وشەی تەوحیدمان کرد و ڕوونمان کردەوە، بێگومان دەبێ بزانین ئەم وشەیە کە ( التوحید )ـە چ گرنگیەکی هەیە، وە ئینسان چ قازانجێك لەم وشەیە ( التوحید ) دەکات؟ بۆیە بإذن الله باسی دەکەین.

ئەم زانستە کە ( التوحید )ـە زۆر زۆر گرنگە چونکە ئینسان کاتێ تەوحیدی نەبوو ئەوا هیچ شتێکی لێ قبوڵ ناکرێ ئەگەرچی زۆریش عیبادەت بکات وەك ( ڕۆژوو ، نوێژ ، زەکات ، حەج... ) چونکە یەکەم شت کە فەرمانی پێکرا تەوحید بوو، واتە تەوحید پێش ( نوێژ – ڕۆژوو – زەکات – حەج ) فەرمانی پێکراوە.

1- بەڵگەشمان ئەو فەرموودەیە: عن إبن عباس قال: لَمَّا بَعَثَ النَّبِيُّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مُعَاذَ بْنَ جَبَلٍ إِلَى نَحْوِ أَهْلِ اليَمَنِ قَالَ لَهُ: «إِنَّكَ تَقْدَمُ عَلَى قَوْمٍ مِنْ أَهْلِ الكِتَابِ، فَلْيَكُنْ أَوَّلَ مَا تَدْعُوهُمْ إِلَى أَنْ يُوَحِّدُوا اللَّهَ تَعَالَى، فَإِذَا عَرَفُوا ذَلِكَ، فَأَخْبِرْهُمْ أَنَّ اللَّهَ قَدْ فَرَضَ عَلَيْهِمْ خَمْسَ صَلَوَاتٍ فِي يَوْمِهِمْ وَلَيْلَتِهِمْ، فَإِذَا صَلَّوْا، فَأَخْبِرْهُمْ أَنَّ اللَّهَ افْتَرَضَ عَلَيْهِمْ زَكَاةً فِي أَمْوَالِهِمْ، تُؤْخَذُ مِنْ غَنِيِّهِمْ فَتُرَدُّ عَلَى فَقِيرِهِمْ، فَإِذَا أَقَرُّوا بِذَلِكَ فَخُذْ مِنْهُمْ، وَتَوَقَّ كَرَائِمَ أَمْوَالِ النَّاسِ» [ متفق عليه ]

واتە: عبد الله ی کوڕی عباس دەفەرمووێت : کاتێك پێغەمبەر ﷺ معاذ ی کوڕی جبلی نارد بۆ یەمەن پێی فەرموو : ( تۆ دەچیت بۆ لای قەومێك کە ئەهلی کیتابن (کیتابیان لەلایەن الله بۆ دابەزیوە) یەکەم شت بانگەشەیان دەکەیت بۆی ئەوەیە کە الله بەتەنها بزانن و بیپەرستن، ئەگەر ئەوەیان زانی (قبوڵیان کرد) هەواڵیان پێ بدە کە الله تعالی پێنج نوێژی لەسەر فەرز کردوون لەشەو و ڕۆژەکانیاندا، ئەگەر نوێژیان کرد هەواڵیان پێ بدە کە الله تعالی زەکاتی لەسەر فەرز کردوون

له دەوڵەمەندەکانیان وەردەگیرێت و دەدرێت بە هەژارەکانیان، جا ئەگەر دانیان بەوەدانا ( قبوڵیان کرد ) لێیان وەرگرە، وە خۆت بپارێزە لەوەی سامانە بەنرخەکانی خەڵک وەربگریت.

ئەگەر سەرنج بدەینە فەرموودەکە دەبینین کە یەکەم شت فەرمانی پێکرابێت بریتیە لە (بەتاك و تەنها زانینی الله تعالی و پەرستنی بە تاك و تەنها).
پێش ئەوەی باسی "نوێژ و ڕۆژوو و حەج و زەکات" بکات، باسی (التوحید)ی کرد، وە دەبێ بزانین کە تەوحید بێ تێگەیشتن لە ماناکەی و گۆشەکانی و جۆرەکانی جێگیر نابێ، وە دەبێ بزانین کە ئەمە سەرەتایەکە بۆ ئەوەی داخلی ئیسلام ببین، بەبێ تەوحید کەس داخیلی ئیسلام نابێت، ئایا هیچ شتێك لەوە گرنگتر هەیە کە پێش " نوێژ و ڕۆژوو و....هتد" فەرمانی پێکرابێت؟ ئایا کاتی ئەوە نەهاتووە خۆمان فێری ئەم "تەوحیدە" پاك و پیرۆزە بکەین تاکو داخلی ئیسلام بین؟ ئایا بەس نیە بێخەم بوون بۆ ئەم دینە ؟!
بەس نیە ئیتر پاڵدانەوە لەماڵەکان لەکاتێکدا کە تەوحید شایەنی خەمخواردنێکی زۆر و ماندوو بوونێکی زۆرە ؟!

2- عَنْ مُعَاذِ بْنِ جَبَلٍ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: «يَا مُعَاذُ، أَتَدْرِي مَا حَقُّ اللهِ عَلَى الْعِبَادِ؟» قَالَ: اللهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ، قَالَ: «أَنْ يُعْبَدَ اللهُ وَلَا يُشْرَكَ بِهِ شَيْءٌ»، قَالَ: «أَتَدْرِي مَا حَقُّهُمْ عَلَيْهِ إِذَا فَعَلُوا ذَلِكَ؟» فَقَالَ: اللهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ، قَالَ: «أَنْ لَا يُعَذِّبَهُمْ» [صحيح أخرجه مسلم]
واتە: لە معاذی کوڕی جبل رضي الله عنه ڕیوایەتکراوە فەرموویەتی: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : { ئەی معاذ ئایە دەزانی مافی الله بەسەر بەندەکانیەوە چیە؟} فەرمووی : الله و پێغەمبەرەکەی زاناترن، فەرمووی : {ئەوەیە کە بەجوانی

بپەرسترێت و هیچ هاوبەشی بۆ بڕیار نەدرێت } فەرمووی : { ئایا دەزانی مافی ئەوان بەسەر الله ـوە چیە ئەگەر ئەوەیان جێبەجێ کرد؟ }
فەرمووی : الله و پێغەمبەرەکەی زاناترن، فەرمووی: { مافیان بەسەر الله ئەوەیە کە هیچ سزایەکیان نەدات }

کەواتە لێرەدا بۆمان ڕوون بوویەوە کە پەرستنی الله تعالى بەتاك و تەنهایی مافی الله یە، وە دەبێ بەتاك و تەنهایی بیپەرستین.

3- فەرموودەی کارتەکە { حديث البطاقة }

"عن عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عَمْرٍو رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قال: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: " يُصَاحُ بِرَجُلٍ مِنْ أُمَّتِي عَلَى رُءُوسِ الْخَلَائِقِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، فَيُنْشَرُ لَهُ تِسْعٌ وَتِسْعُونَ سِجِلًّا كُلُّ سِجِلٍّ مَدَّ الْبَصَرِ، ثُمَّ يُقَالُ لَهُ: أَتُنْكِرُ مِنْ هَذَا شَيْئًا؟ فَيَقُولُ: لَا يَا رَبِّ، فَيَقُولُ: أَلَكَ عُذْرٌ، أَوْ حَسَنَةٌ؟ فَيَهَابُ الرَّجُلُ، فَيَقُولُ: لَا يَا رَبِّ، فَيَقُولُ: بَلَى إِنَّ لَكَ عِنْدَنَا حَسَنَاتٍ، وَإِنَّهُ لَا ظُلْمَ عَلَيْكَ، فَيُخْرَجُ لَهُ بِطَاقَةٌ فِيهَا أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَأَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ، فَيَقُولُ: يَا رَبِّ مَا هَذِهِ الْبِطَاقَةُ مَعَ هَذِهِ السِّجِلَّاتِ؟ فَيَقُولُ: إِنَّكَ لَا تُظْلَمُ، قَالَ: فَيُوضَعُ السِّجِلَّاتُ فِي كِفَّةٍ، وَالْبِطَاقَةُ فِي كِفَّةٍ فَطَاشَتِ السِّجِلَّاتُ، وَثَقُلَتِ الْبِطَاقَةُ" [ رواه الحاكم في مستدركه ]

واتە: لە عبد اللهـی کوڕی عەمرو رضي الله عنه ڕیوایەتکراوە فەرموویەتی: پێغەمبەری الله ﷺ دەفەرمووێت : { بانگی پیاوێك دەکرێت لەسەرانی خەڵک لەڕۆژی قیامەت، ئینجا نەوەد و نۆ دەفتەر(تێنوس)ـی بۆ پان دەکرێتەوە هەر دەفتەرێك بە قەد بینینی چاوەکان درێژە، ئینجا پێی دەوترێت : ئایا ئینکاری هیچ شتێك لەمە دەکەیت؟ دەڵێت : نەخێر ئەی پەروەردگارا، دەفەرمووێت : ئایا هیچ

**عوزر و بیانوویەك یاخود چاکەیەکت هەیە؟ پیاوەکە دەترسێت و دەڵێت : نەخێر ئەی پەروەردگارا، دەفەرمووێت:**
**نەخێر بەڵکو تۆ لای ئێمە هەندێ چاکەت هەیە، هەروەها هیچ زوڵم و ستەمێك لەسەرت نیە، جا کارتێکی بۆ دەردەهێنرێت تیایدا هاتووە:**
**{ أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَأَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ } دەڵێت : ئەی پەروەردگارا، ئەم کارتە چیە لەگەڵ ئەم دەفتەرانە؟ دەفەرمووێت : تۆ ستەمت لێ ناکرێت**
**فەرمووی: جا دەفتەرەکان دەخرێنە نێو قاپێکی تەرازوو وە کارتەکەش دەخرێتە قاپێك لەئەنجامدا دەفتەرەکان سوك و کەم دەبنەوە و کارتەکەش قورس و گران دەبێت.**
**ئایا چ شتێك لەوە گرنگترە کە نەهێڵیت بچیتە دۆزەخی تاهەتایی؟ ئەو دۆزەخەی کە بە زایدکردنی مرۆڤەکان ئاگرەکەی زیاتر دەبێت ( واتە وەك سوتەمەنی ).**
**ئایا ئام دونیا کاتییە ئەوە دەهێنێت بەهەشتێکی بێ پایان و ڕازاوە لەدەست بدەم؟**
**ولله الحمد والله المستعان**

# بەشی دووەم

## بـــاســـی یەکەم | مانـای لا إلـه إلا الله

**لا إله إلا الله واتە :. هیچ پەراستراوێك نییە بەحەق جگە لە الله تعالی.**
**کەئەمەش بە نفي و إثبات ئەبێ.**
**النفي (لا إله) : واتە لادانی هەموو جۆرە بتێک و پەرستراوک جگە لە الله هەروەها بەرِائەت کردن و کوفرکردن پێیان وەک (طاغوت . خوشەویستانی . شوێنکەوتووانی)**

**إثبـات (إلا الله): واتە جێگـیر کـردن وو چەسـپاندن کە جـگە لە الله تعـالی هـیچ پەرستراوێکی تر شایەنی پەرستن نییە.**

## باسی دووەم | مەرجەکانی لا إلـه إلا الله

**لا إله إلا الله چەنـد مەرجێ لەخـۆدەگرێ کە هەرکەسـێک یەکێـک لەو مەرجـانەی تێدا نەبێ ئەوا لا إله إلا الله لێی وەرناگیرێ، کە مەرجەکانیش ئەمانەن :**

**1. ( العلم ) زانینی ماناکەی :. واتە زانینی ئەوەی کە لا إله إلا الله مانای چیە وە چی لەخۆدەگرێ وەک الله تعالی دەفەرمووێ :. (فَاعْلَمْ أَنَّهُ لَا إِلَـهَ إِلَّا اللَّهُ)**
**واتە : بزانە کەهـیچ پەرسـتراوێک نـیە بەحەق جگە لە الله نەبێ، یان دەفەرموێ :. (إِلَّا مَن شَهِدَ بِالْحَقِّ وَهُمْ يَعْلَمُونَ).**

واتە : تەنها ئەوانەی کەشایەتیان داوە بەحەق دەزانن . واتە دەزانن لا إله إلا الله چیە و چۆنە و چی لەخۆدەگرێ وە چ شتێ ئەو هەڵدوەشێنێتەوە وە چ شتێ ئەو جێگیر دەکات.
وە ئازیزمان درودی خوای لەسەربێ دەفەرموی ( من مات وهو يعلم أنه لا إله إلا الله دخل الجنة ) [رواه مسلم عن عثمان رضي الله عنه]
واتە : هەرکەسێ لەسەر ئەوە بمرێ کەبزانێ هیچ پەرستراوێک نیە بەحەق جگە لە الله نەبێ ئەوا دەچێتە بەهەشت، لەهەموویان دەبینین زانین بەمەرج دانراوە.

2- ( اليقين ) دڵنیایی : کە بریتیە لەزانیاری تەواو دەربارەی لا إله إلا الله وە دوور بێ لەدوو دڵی و شک و گومان.

الله تعالی دەفەرمووێ : ( إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ الَّذِينَ آمَنُوا بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ ثُمَّ لَمْ يَرْتَابُوا وَجَاهَدُوا بِأَمْوَالِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ فِي سَبِيلِ اللَّهِ ۚ أُولَـٰئِكَ هُمُ الصَّادِقُونَ ) [الحجرات : ١٥]
بێگومان ئیماندارانی ڕاست ئەوانەن کەباوەڕیان بە الله و پێغەمبەرەکەی هێناوە و پاشان نەکەوتوونەتەهیچ گومان و دوودڵیەکەوە، بەخۆیان و سەرو ماڵیشیانەوە تێکۆشاون لەپێناوی ئاینی الله، ئا ئەوانە ڕاستگۆیانن.
لەم ئایەتە پیرۆزەدا نەبوونی شک و گومان بەمەرج دانراوە بۆڕاستگۆیی برواهێنان بە الله و پێغەمبەرەکەی ﷺ .چونکە ئەوکەسەی شک و گومانی لەدڵدا هەبێ ئەوا لەدووڕووانە.
پێغەمبەریش (ﷺ ) دەفەرموێ :( أشهد أن لا إله إلا الله وإني رسول الله لا يلقى الله بهما عبد غير شاك فيهما إلا دخل الجنة ) رواه مسلم.

**واته : شـايەتی دەدەم کەهـیچ پەرسـتراوێك نـیە بەحەق جـگە لە الله وە منـیش نـێردراوی اللهـم هەربەنـدەیەک لەڕۆژی دوایی بەم دوو وشــەیە بە الله بگـاتەوە بەمەرجێک لەم بارەوە شک و گومانی لەدڵدا نەبووبێ ئەوا دەچێتە بەهەشت.**
**لەگێڕانەویەکی تردا هاتووە (.....لا یلقی بهما عبدا غیر شاك فیهما فیحجب عن الجنة ) رواه البخاري.**
**واتـە :ـ لەڕۆژی دوایی الله بەهەر بەنـدەیەک بگاتەوە و ئەو بەنـدەیە هـیچ شـک و گومانی لەم دوو وشەیە نەبێ ئەوا بەهەشتی لێ قەدەغە ناکرێت.**

**هەروەها لەفەرموودەیەکی تردا پێغەمبەر (ﷺ) بە أبو هريرة دەفەرموێ :**
**((من لقیت من وراء هـذا الحـائط یشـهد أن لا إله إلا الله مستیقنا بها قلـبه فـبشره بالجنة)).**
**واته : ئەوەی پێیگەیشـتیت لەپشـت ئەم دیـوارە لەنـاخی دڵـیەوە شـایەتی دەدا بە لا إله إلا الله ئەوا مـژدەی بەهەشـتی پێبـدە. دەبینـین لـێرەدا جەخـت لەسـەر ئەوە دەکاتەوە کە لەناخی دڵیەوە وابڵێ ئەگینا قبوڵ ناکرێ.**

**3- ( الإخلاص ) : دڵسۆزی و خۆیەکلایی کردنەوە بۆ الله و دوورکەوتنەوە لەشرک و هاوەڵ بڕیاردان.**

**الله تعالی دەفەرموێ ( ألا لله الدین الخالص ) [ الزمر : ٣ ]**
**واتە : لەسەر خەڵکی پێویستە بەدڵسۆزی بچنە ناو ئایینەوە و بەتەنها الله پەرستن.**

**هەروەها دەفەرموێ : ( وما أمروا إلا لیعبدوا الله مخلصین له الدین ) البینة (٥).**
**واتە : تەنهـا فەرمانیـان بەوە پێـدرابوو کە الله بپەرسـتن بەدڵسـۆزی بچـنە نێـو ئاینەکەی و دووربکەونەوە لەهەموو جۆرێک لەجۆرەکانی شیرک بڕیاردان.**

پێغەمبەری ئەزیز دەفەرموێ :. ( أسعد الناس بشفعاتي من قال لا إله إلا الله خالصا من قلبه أو نفسه ).

واته : بەختەوەرترین کەس لە رۆژی دوایی بەتکاکردنی من کەسێکە کە بەدڵسۆزی لەناخی دڵیەوە وتبێتی لا إله إلا الله.
هەروەها دەفەرموێ : ( إن الله حرم على النار من قال لا إله إلا الله يبتغي بذلك وجه الله عزوجل ).
واته :ـ الله ئەوکەسەی لەچوونە ناو دۆزەخ قەدەغە کردووە کە وتویەتی لا إله إلا الله مەبەستیشی تەنها ڕەزامەندی الله بێت.

هەروەها دەفەرموێ :ـ (مَا قَالَ عَبْدٌ قَطُّ: لَا إِلَهَ إِلَّا اللهُ، وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ، وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ، مُخْلِصًا بِهَا رُوحُهُ، مُصَدِّقًا بِهَا قَلْبُهُ لِسَانَهُ، إِلَّا فُتِقَ لَهُ أَبْوَابُ السَّمَاءِ حَتَّى يَنْظُرَ اللهُ إِلَى قَائِلِهَا، وَحُقَّ لِعَبْدٍ نَظَرَ اللهُ إِلَيْهِ أَنْ يُعْطِيَهُ سُؤْلَهُ).
واته : [ ئەوەی بڵێ " لا إله إلا الله وحده لا شريک له له الملك وله الحمد وهو على كل شيء قدير " بەدڵسۆزی و لەناخی دڵیەوە پێ بەزوبانیش دەرکی پێ بکات بەڕاستی بخاتەوە ئەوا الله بۆ ئەم وتەیە ئاسمان لەت دەکات بۆ ئەوەی سەیری ئەو کەسە بکات کە وتویەتی هەر بەندەیەکیش الله سەیری بکات ئەو حەقی خۆیەتی ئەوەی داوا بکات پێی ببەخشرێ.

4- ( الصدق ): ڕاستگۆیی و دوور بێ لەدوو ڕوویی واتە بەڕاستگۆیانە لەگەڵ ئەم لا إله إلا الله یە بجوڵێینەوە ئەگینا وەک دوو ڕووان مامەڵە دەکەین چونکە دوو ڕووەکان ڕاستگۆ نەبوون.

( أَحَسِبَ النَّاسُ أَن يُتْرَكُوا أَن يَقُولُوا آمَنَّا وَهُمْ لَا يُفْتَنُونَ (٢) وَلَقَدْ فَتَنَّا الَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ ۖ فَلَيَعْلَمَنَّ اللَّهُ الَّذِينَ صَدَقُوا وَلَيَعْلَمَنَّ الْكَاذِبِينَ (٣) ) العنكبوت.
واتە : ئایا خەڵکی وایانزانیوە، وازیان لێدەهێنرێت و پشتگوێ دەخرێن کە بڵێن ئیمان و باوەڕمان هێناوە، لەکاتێکدا ئەوان تاقی نەکرێنەوە و تووشی سزا و ئازار نەکرێن؟

سوێند بە الله بێگومان ئێمە ئەوانەی پێش ئەمانمان تاقیکردۆتەوە بە جۆرەها شێوە، تا الله تعالی (لە جیهانی واقیعدا) ئەوانەی ڕاستیان کردووە بیانناسێت و دەرکەون، هەروەها درۆزنەکانیش دەبێت بناسێت و دەرکەون.

( وَمِنَ النَّاسِ مَن يَقُولُ آمَنَّا بِاللَّهِ وَبِالْيَوْمِ الْآخِرِ وَمَا هُم بِمُؤْمِنِينَ (٨) يُخَادِعُونَ اللَّهَ وَالَّذِينَ آمَنُوا وَمَا يَخْدَعُونَ إِلَّا أَنفُسَهُمْ وَمَا يَشْعُرُونَ (٩) فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٌ فَزَادَهُمُ اللَّهُ مَرَضًا ۖ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ بِمَا كَانُوا يَكْذِبُونَ (١٠) ) البقرة.
واتە : لە ناو خەڵکیدا کەسانێک هەن کە دەڵێن: ئیمان و باوەڕمان بە الله و بە ڕۆژی قیامەت هێناوە (لەڕاستیدا ئەوانە درۆ دەکەن) ئەوانە هەمیشە باوەڕدار نین.
ئەوانە (بەخەیاڵی خۆیان وا دەزانن) الله و ئەو کەسانە دەخەڵەتێنن کە باوەڕداری ڕاستەقینەن!! کەچی جگە لە خۆیان کەسیان پێ ناخەڵەتێنرێ، بەڵام هەست ناکەن و تێناگەن و بیرناکەنەوە.
ئەوانە لە دڵ و دەروونیاندا نەخۆشی بێ باوەڕی و حەسوودی و کینە هەیە، خوایش دەردیان گران و کاریگەر دەکات و سزایەکی سەختیش (لە دینا و قیامەتدا) چاوەڕێنانە بە هۆی درۆکردن و (دژایەتییان بۆ ئیسلام).
پێغەمەریش ( ﷺ ) دەفەرموێ :ـ {{ ما من أحد يشهد أن لا إله إلا الله وأن محمدا عبده ورسوله صدقا من قلبه إلا حرمه الله على النار }}. متفق عليه.
واتە : هەرکەسێ شایەتی بدات بە لا إله إلا الله محمد رسول الله بەڕاستی لەناخی دڵیەوە ئەوا الله تعالی نایخاتە ناو ئاگر و لێی قەدەغە دەکات.

5- ( المحبـة ) خۆشويسـتن : خۆشەويسـتيمان هەبێ بـۆ ئەو وشـەيە و بەكـردار بيسـەلمێاين كە خۆشـمان دەوێت وە ئەو شـتانەی دەلالەت لەو دەكات دڵخـۆش بين پێيەوە.
( وَمِنَ النَّاسِ مَن يَتَّخِذُ مِن دُونِ اللَّهِ أَندَادًا يُحِبُّونَهُمْ كَحُبِّ اللَّهِ ۖ وَالَّذِينَ آمَنُوا أَشَدُّ حُبًّا لِّلَّهِ ). البقرة - ١٦٥
واتـە :ـ (لەگـەڵ ئـەو هـەموو بـەڵگـە ئاشـكرايانەدا) هەنـدێك كـەس هـەيە لـەجياتی ئەوەی الله بپەرستێت، شتانی تر دادەتاشێت بۆ خۆی و (شوێن ڕێنموویيەكانی الله ناكەوێت و) خۆشەويستی و سۆزی دەدات بەو بت و بەرنامۆلكەو توولە ڕێگەيانە و خۆشی دەوێن، وەك چۆن ئيمانداران خوايان خۆش دەوێت، بەڵام ئەوانەی ئيمان و باوەڕيان هێناوە زۆر زياتر الله يان خۆش دەوێت.

( يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا مَن يَرْتَدَّ مِنكُمْ عَن دِينِهِ فَسَوْفَ يَأْتِي اللَّهُ بِقَوْمٍ يُحِبُّهُمْ وَيُحِبُّونَهُ أَذِلَّةٍ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ أَعِزَّةٍ عَلَى الْكَافِرِينَ يُجَاهِدُونَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَلَا يَخَافُونَ لَوْمَةَ لَائِمٍ ) المائدة ٥٤.

واتە : ئـەی ئەوانـەی باوەڕتـان هێناوە، هـەر كـەس لـە ئێوە لـە ئاين و بەرنامەكـەی وەرگەڕێت و پاشگەز ببێتەوە، ئەوە (هەر خۆی زەرەر دەكات) ئەوە لە ئايندەدا الله كەسانێک دەهێنێتە كايەوە (ئەوەندە ڕێک و پێک و باوەڕ دامەزراون) پەروەردگاری مـەزن خـۆشی دەوێـن، ئـەوانيش ئـەويان خـۆش دەوێـت، هـەروەها ملكـەچ و فەرمانبەردارو بەسۆزن بۆ ئيمانداران و سەربڵندو نەخۆرو دەروون بەرزن بەسەر بێباوەڕاندا، لە پێناو ڕێبازی الله و بۆ بەدەستهێنانی ڕەزامەندی ئەو هەوڵ دەدەن و خەبات دەكەن و تێدەكۆشن، لە لۆمەی لۆمەكەرانيش ناترسن.

**پێغەمبەری ئەزیز ( ﷺ ) دەفەرموێ :ـ [ ثلاث من كن فيه وجد حلاوة الايمان أن يكون الله ورسوله أحب اليه مما سواهما وأن يحب المرء لا يحبه إلا لله وأن يكره أن يعود في الكفر بعد إذ أنقذه الله منه كما يكره أن يقذف في النار ] متفق عليه.**

**واتـە : هەرکەسێ ئەم سێ خەسـڵەتەی تێـدابێ شـیرینی ئیمـانی چەشـتووە ، الله و پێغەمبەرەکەی لەهەموو شتێ لا خۆشەویستر بێ ،هەر مرۆڤێکی خۆشویست تەنها بۆ الله خـۆشی بوێ ، وەهەڵگەڕانەوەی لەئیسـلامەوە بۆکوفر هەنـدە لاناخۆش بێ کە چۆن لای ناخۆشە بیهاوێتە ناوئاگر.**

**6- ( الإنقيـاد ) ملـکەچ بـوون بۆفەرمانەکـانی و خۆدانـە دەسـتی :ـ واتە هەکارێـک کەدەیکەیـن تەنیا مەبەسـتمان ڕەزامەدی ئەو بێت و هەر فرمانێک ئەو دەیەوێت جێبەێی بکەین بە ملکەچی.**

**الله تعالی ئەفەرموێ :ـ (وَأَنِيبُوا إِلَىٰ رَبِّكُمْ وَأَسْلِمُوا) الزمر ٥٤**
**واتە : هـەوڵ بدەن هەمیشـە و بـەردەوام دڵتان لای الله بێت و بگـەڕێنـەوە بۆ لای پەروەردگارتان و تەسلیمی ئەوبن.**

**وە دەفەرمـووێ : ( وَمَنْ أَحْسَـنُ دِينًا مِّمَّنْ أَسْـلَمَ وَجْهَـهُ لِلَّهِ وَهُـوَ مُحْسِـنٌ ) النسـاء ١٢٥**
**واتە : کێ هـەیە ئاینی چاکترە پەسـەندترو جـوانتر بێت لـەو کەسـەی ڕووی کردۆتـە الله و خۆی تەسلیمی ئەوزاتە کردووەو لەکاتێکدا کارجوان و کار پەسەندە.**

**وە دەفەرمـوێ : ( وَمَـن يُسْـلِمْ وَجْهَـهُ إِلَى اللَّهِ وَهُـوَ مُحْسِـنٌ فَقَـدِ اسْتَمْسَـكَ بِالْعُرْوَةِ الْوُثْقَىٰ) لقمان ٢٢**

واتە : ئەو کەسەی بەدڵسۆزی و ملکەچیۆ بۆ الله و چاکە بکات ئەوا دەستی گرتووە بەدەست بەندێکی توند (واتە :. لا إله إلا الله).

وەدەفەرمویۆ : ( فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤْمِنُونَ حَتَّىٰ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ ثُمَّ لَا يَجِدُوا فِي أَنفُسِهِمْ حَرَجًا مِّمَّا قَضَيْتَ وَيُسَلِّمُوا تَسْلِيمًا )النساء ٦٥

واتە : نەخێر، سوێند بە پەروەردگارت ئەوانەی (لاڤی بڕوا لێدەدەن) بڕوا ناهێنن هەتا لە هەموو کێشەیەکدا کە ڕوودەدا لە نێوانیاندا تۆ نەکەن بە دادوەرو گوێڕایەڵی تۆ نەکەن، دوای ئەوەش نابێت لە دڵ و دەروونیاندا هیچ نارەزاییەک دروست ببێت بەرامبەر ئەوەی کە داوەریت لەسەر کردووە و دەبێت بەتەواویی تەسلیم بن و ڕازیی بن.

7- ( القبـــول ) وەرگـــرتنی لا إله إلا الله: واتە لا إله إلا الله وەربگـــری بەوشـــێوە حەقیقەی خۆی وەدووربیۆ لەرەت کردنەوە.
الله تعالی ئەفەرمویۆ : ( وَكَذَٰلِكَ مَا أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ فِي قَرْيَةٍ مِّن نَّذِيرٍ إِلَّا قَالَ مُتْرَفُوهَا إِنَّا وَجَدْنَا آبَاءَنَا عَلَىٰ أُمَّةٍ وَإِنَّا عَلَىٰ آثَارِهِم مُّقْتَدُونَ (٢٣) قَالَ أَوَلَوْ جِئْتُكُم بِأَهْدَىٰ مِمَّا وَجَدتُّمْ عَلَيْهِ آبَاءَكُمْ ۖ قَالُوا إِنَّا بِمَا أُرْسِلْتُم بِهِ كَافِرُونَ (٢٤) فَانتَقَمْنَا مِنْهُمْ ۖ فَانظُرْ كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ الْمُكَذِّبِينَ(٢٥) ) "الزخرف."
واتە : هەر بەو شێوەیە هیچ پێغەمبەرێکمان نەناردووە بۆ هیچ شارێك، کە خۆشگوزەرانەکان نەیانوتبێت: ئێمە باوو باپیرانی خۆمان بینیووە پابەندی بیروباوەڕێك بوون، بێگومان ئێمەش چاو لەوان دەکەین و پەیرەوی ئەوان دەکەین.

**پێغەمبەرەکەش وتوویەتی: باشە... ئەگەر لە ڕێگە و ڕێبازو بەرنامەی باو و باپیرانتان چاکتریشم بۆ هێنان هەر شوێنیان دەکەون؟! لە وەڵامدا وتیان: بەڕاستی ئێمە بەو بەرنامە و پەیامەی کە بە ئێوەدا ڕەوانە کراوە بڕوا ناکەین.**
**جا ئێمەش تۆڵەمان لێسەندن، سەرنج بدە و ببینە سەرئەنجامی ئەوانەی بڕوایان بە پەیامی پێغەمبەران نەکرد چۆن بوو.**

**8- (الكُفـرُ بِمَـا يُعبَـدُ مِـنْ دُونِ اللهِ ) : ئەبێ جگە لە الله هیچ پەرستراوێکی تر نەپەرستی نەک هەر ئەوەش بەڵکو دەبێت کافر بیت پێیان.**
**الله تعالى ئەفەرموێ : (فَمَن يَكْفُرْ بِالطَّاغُوتِ وَيُؤْمِن بِاللَّهِ فَقَدِ اسْتَمْسَكَ بِالْعُرْوَةِ الْوُثْقَىٰ). البقرة – ٢٥٦.**
**واتە : جا ئەوەی باوەڕی نەبێت بە - تاغوت - (کە بریتیە لە: هەموو ڕێگەو ڕێبازو هێزو بەرنامەو لادان و بتێک)و باوەڕی دامەزراو بهێنێت بە الله، جا بێگومان ئەوکەسە دەستی گرتووە بە بەهێزترین هۆکاری ڕزگارییەوە کە (لا إله إلا الله).**
**کەواتە ئەبێ کافر بیت پێیان ئەگەر ئەوە نەڵێیت لەماڵی خۆت دابنیشی. و نوێژ و عیبادەت بکەی و بڵێی من بەس نوێژ و عیبادەت دەکەم و هیچ پەیوەندیەکم بەخەڵکەوە نییە وە خەڵکیش بەکافر دانانێم کە الله و پێغەمبەرەکەی ( صلى الله عليه وسلم ) بەکافریان داناوە**
**زانایان دەفەرموون : بەم ئایەتە تۆ کافری. چونکە تۆ دەبێ کافر بەکافر دابنێیت و بەکافر بڵێیت کافر نابێ بڵێی هیچ پەیوەندیەکی بەمنەوە نییە.**
**ئێستا خەڵکی ئەبینین دەڵێ نوێژو عیبادەت ئەکەم هیچ پەیوەندیم نیە کاتێ الله تعالى دەفەرمووێ ( فمن يكفر بالطاغوت ) بەمەرجی گرتووە کەئەبێ کوفر بە طاغوت بکەی ( يكفر ) واتە تۆ ئەبێ تەکفیر بیت بەوکەسەی کە الله تعالى بەکافری داناوە وەئەوانەی کە الله تعالى ناپەرستن یان الله تعالى بپەرستێ لەگەڵیشی شتێکی تریش بپەرستێ و عیبادەتی بۆ بکات.**

**ئەگەر هاتوو ئەو کەسە تەکفیر نەکەی و بەکافری دانەنێی کە اللّٰه تعالی بەکافری داناوە ئەوا خۆت کافر ئەبی چونکە اللّٰه بەدرۆئەخەیتەوە {جل وعلا}.**
**بۆیە موسڵمانانی بەرێز ئەمە کەمەرجەکانی لا إله إلا اللّٰه یە پێویستە تیاماندا هەبێ گەر لەیەک مەرج کەموکورتیمان هەبێ ئەوا لا إله إلا اللّٰه هەڵدەوەشێتەوە و قبوڵ نابێ.**

# بەشی سێیەم

## باسی یەکەم | گۆشەکانی تەوحید

تەوحید دوو گۆشەی هەیە ( للتوحید ركنان ) :

**الركن الأول**: النفي وهو مأخوذ من قوله ( لا إله ) :
نەفی کردن : واتە ڕەتکردنەوە و باوەڕ نەبوون بە جگە لەو شتانەی کە لەجیاتی اللّٰه تعالی دەپەرسترێن.

- کافربوون پێیان و بەرائەتکردن لەو شتانەو لەو کەسانەشی کە دەیپەرستن [ وەك طاغوت و سەربازەکانی و خۆشەویستانی ]

**الركن الثاني** : الإثبات وهو مأخوذ من قوله تعالى ( إلا اللّٰه )
چەسپاندن و باوەڕ بوون بە اللّٰه تعالی ( واتە ئیللا باوەڕ بە اللّٰه بهێنی ).

ئیبن قەییم – رحمه الله – دەفەرمووێت : ( وطريقة القرآن في مثل هذا أن يقرن النفي بالإثبات، فينفي عبادة ما سوى اللّٰه ويثبت عبادته وهذا هو حقيقة التوحيد )

واتە: ڕێچکەی قورئان لەشتی لەم شێوەیە ئەوەیە کە نەفی(ڕەتکردنەوە) ببەستێتەوە بە إثبات(چەسپاندن)، جا پەرستنی جگە لە اللّٰه تعالی ڕەتدەکاتەوە و پەرستنی اللّٰه تعالی دەچەسپێنێت، کە ئەمەش بریتیە لەحەقیقەت و ڕاستەقینەیی تەوحید.

# باسی دووەم | جۆرەکانی تەوحید

**تەوحید پێك دێت لە سێ جۆر، کە پێویستە باش بیانزانین و کاریان پێ بکەین**

**1- توحيد الربوبية ( تەوحیدی پەروەردگاریەتی )**

**2- توحيد الألوهية ( تەوحیدی پەرستن )**

**3- توحيد الأسماء والصفات ( تەوحیدی ناو و سیفاتەکان )**

**یەکەم/ توحيد الربوبية ( تەوحیدی پەروەردگاریەتی ) مانای چیە؟**

**محمد ی کوڕی عبد الوهاب دەفەرمووێت:**
**( والمقصود بتوحيد الربوبية :- أي إفراد الله بأفعاله وهو توحيد الله بالخلق والملك والتدبير، فلا ينسب من أفعال الله التي اختص بها لغيره فهو وحده الخالق الرازق المحي المميت الضار النافع المدبر إلى غير ذلك مما أثبته سبحانه لنفسه ).**
**واتە: مەبەست لەتەوحیدی پەروەردگاریەتی: بەتەنها زانینی الله لە کردەوەکانی، واتە تەنها الله بەدیهێنەر و خاوەنی ئەم بوونەوەرە و تەنها خۆی بوونەوەر بەڕێوەدەبات و سەرپەرشتی دەکات، وە نابێت ئەم کردەوانە بدرێنە پاڵ هیچ کەسێکی تر جگە لە الله، وە بەتەنها خۆی بوونەوەر دەژیێنێ و دەمرێنێ وە تەنها خۆی رزق و ڕۆزی بوونەوەرەکان دەدات و تەنها خۆی زیان گەیەنەر و سود**

گەیەنەرە و بەڕێوەبەرەو ئەمانەو سیفەتەکانی تریش کە اللە تعالی خۆی جێگیری کردوون بۆ خۆی ( لەقورئان و سوننەت باسی کردوون ).
وە هەروەها ( حەڵاڵ – حەرام – حوکم و تەشریع "یاسادانان" ) تایبەتە بە اللە تعالی خۆی، وە تەنها اللە خۆی دانەر و دیاریکەری ئەم شتانەیە.
بابەتی حوکم کردن بەقورئان کارکردن بە شەریعەت دەچێتە ناو باسی تەوحیدی پەروەردگاریەتی ( توحید الربوبیة ) ئەمە شتێکی ڕوونە لەبەر ئەوەی حوکم و فەرمان و تەشریع " یاسادانان " سیفاتێکە تایبەتە بە اللە تعالی، وە ئەو کەسەی لەمەدا ململانێ و ڕکابەری بکات بەکافری داناوە.
هەروەك اللە تعالی فەرموویەتی : { أَلَا لَهُ الْخَلْقُ وَالْأَمْرُ } الأعراف – ٥٤.
واتە: ئاگاداربن و بزانن و تێبفکرن کە هەرچی دروستکردن و بەدیهێنان و فەرمان و بڕیاردان هەیە هەمووی بۆ ئەوە.

کەواتە با هەمووومان فەرمانبەرداری ئەو بین و لەفەرمانی دەرنەچین.
هەروەها اللە تعالی هەواڵی داوە کە حوکم تەنها بۆ خۆیەتی و هیچ هاوبەش و شەریکی نیە، اللە تعالی دەفەرمووێت: { لَا يُشْرِكُ فِي حُكْمِهِ أَحَدًا } الكهف – ٢٦.
واتە: بێگومان اللە تعالی لەکار و فەرمانڕەوایی و بڕیاردا تاك و تەنهایەو کەس هاوبەشی نیە لە حوکم و فەرمان.

ڕوونتر بڵێین حوکم بۆ هیچ حیزب و لایەنێك نیە، جا عەلمانی بێت یان بەناو ئیسلامیەکان بێت، چونکە ئەمانە طاغوتن تەنها دەیانەوێت خەڵک هەڵبخەڵەتێنن، بێگومان بەشی الربوبیة "پەروەردگاریەتی" زۆر گرنگە بەڵام بێ بەشی پەرستش ( عیبادەت ) نابێت بە موسڵمان، لەبەر ئەوەی کافرەکانی وەك ئەبو جەهل و هاوشێوەکانی باوەڕیان بە پەروەردگاریەتی اللە هەبوو ( کە مردن و ژیان و

ڕزق و ڕۆزی و دروستکردن و....هتد ) بەدەستی الله یە، بەڵام داخیلی ئیسلام نەبوون چونکە ملکەچ نەبوون بۆی لەعیبادەت کردن و بەقسەکردنی.

هەروەك الله تعالی دەفەرمووێت : { وَلَئِن سَأَلْتَهُم مَّنْ خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ لَيَقُولُنَّ اللَّهُ ۚ قُلِ الْحَمْدُ لِلَّهِ ۚ بَلْ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْلَمُونَ } لقمان – ٢٥.

واتە: سوێند بە الله ئەگەر پرسیار لە بێباوەڕان بکەیت: کێ ئاسمانەکان و زەوی دروست کردووە، ئەوە بە دڵنیاییەوە دەڵێن: (الله)، دروستی کردوون، تۆش ئەی محمد (ﷺ) بڵێ: سوپاس و ستایش بۆ الله (لەسەر وتنی ڕاستی)، نەخێر وانییە، ئەو وەڵامە لە قەناعەتەوە هەڵنەقوڵاوە، بەڵکو زۆربەیان نازانن (لە خۆیانەوە قسە دەکەن).

هەروەها الله تعالی دەفەرمووێت : { وَلَئِن سَأَلْتَهُم مَّنْ خَلَقَهُمْ لَيَقُولُنَّ اللَّهُ ۖ فَأَنَّىٰ يُؤْفَكُونَ } الزخرف – ٨٧.

واتە: سوێند بە الله ئەگەر لەو بێباوەڕانە بپرسیت: کێ دروستی کردوون، ئەوە بەدڵنیاییەوە دەڵێن (الله)، کەوابوو بەرەو چی و بەرەو کوێ لە ڕێبازی ڕاست لادەدرێن و شوێنی ناحەق دەکەون؟!

بۆیە ئەو کەسانەی کە ئەمڕۆ بۆ پارە کوفر دەکەن و دەبنە سەربازانی طاغوتان واتە لە ئەبو جەهل زۆر خراپترن، چونکە ئەو دەیزانی ڕزق لای الله یە بەڵام ئەمانەی ئەمڕۆ وادەزانن ئەگەر نەبنە سەربازانی طاغوتان و کوفریان بۆ نەکەن ئەوا لەبرسان دەمرن !، زۆر سەیرن !!

سەربازانی طاغوتان ئەی ئەو کەسەی لایەنگری هەر حیزبێکی عەلمانی یان بەناو ئیسلامیەکانی، ئەی ئەو کەسەی کە خۆشەویستیت بۆ طاغوتان و شوێنکەوتووانیان هەیە تکایە وەرنەوە هۆش خۆتان تاکەی قیامەتێکی هەتا هەتایی دەفەوتێنن بۆ دونیایەکی کاتی؟

تاکەی خزمەتکاری کەسێکی کە الله لێی تورەیە؟

تاکەی خۆشەویستیت بۆ کەسێك دەبێت کە الله ڕقی لێیەتی؟

**تا کەی دەبیتە کۆیلەی ئەم طاغوتانە؟**
**تەنیا لەبەر ئەوەی بڕە پارەیەکی دیاریکراوت پێدەدەن خزمەتیان دەکەی و دەبیتە کۆیلەیان؟!**
**ئەگەر ئەو پارەیە وەرنەگری و وازیان لێ بێنی دەمریت لەبرسان؟؟**
**ئەگەر پێت وابێت دەمری لەبرسان مانای وایە تۆ غیرەتی پەیداکردنی ماڵ و نانێکی حەڵاڵت نیە.**
**ئایا کاتی ئەوە نەهاتووە ئیتر الله بەتەنها بپەرستین و هەرچی ئەو پێی خۆشبوو بیکەین و هەرچی ڕقی لێبوو وازی لێ بهێنین؟**
**ئایا کاتی ئەوە نەهاتووە واز لەو طاغوتانە بهێنین؟**
**ئایا کاتی ئەوە نەهاتووە کە پێیان بڵێین ڕزق و ڕۆزی و مردن و ژیان بەدەست الله یەو ئیتر جگە لە الله بەندایەتی بۆ هیچ کەسێك ناکەین؟!**
**"لا إله إلا الله وحده لا شريك له، له الملك وله الحمد وهو على كل شيء قدير".**

**دووەم : الألوهية ( پەرستراوێتی )**

**محمد بن عبد الوهاب رحمه الله دەربارەی الألوهية دەفەرمووێت:**

**هو إفراد الله تعالى بأفعال العباد.**
**واتە: بەتاکدانانی الله تعالی لەکردەوەکانی بەندەکان ( واتە گشت ئەو کردەوانەی کە بەندە ئەنجامی دەدات تەنیا بۆ الله تعالی بێت )**

**تەوحیدی ( پەرستراویەتی ) بە دوو شت دادەمەزرێ :**
**1- پەرستنی الله تعالی بەو شێوەیەی کە پێغەمبەرمان ﷺ ڕوونی کردۆتەوە.**

2- خـۆبەریکردن لەپەرسـتنی جـگە لە اللە تعـالی وەکـو کـوفرکردن بە طـاغوت کە هیچیان بەبێ ئەویتریان نابێت ئەگەر هەردووکیان یان یەکێکیان نەکات ئەوا کافر دەبێت.
[ واتە یەکێکـان بەبێ ئەویتریـان نابێـت دەبێ هەردووکیـان ئەنجـام بـدەیت، کە خۆبەریکردن لە پەرستنی جگە لە اللە تعالی وەکو کوفرکردنە بەطاغوت ]

## گۆشەکانی تەوحیدی پەرستراویەتی:

چوار گۆشەی هەیە کە بەبێ ئەمانە دروست نیە:

یەکەم : گوفتاری دڵ بەناسینی اللە تعالی و باوەڕبوون پێی.

دووەم : کـردەوەی دڵ بەتـاك پەرسـتنی اللە تعـالی لەهەمـوو عیبادەتەکـانی، وەك (ئومێد – خۆشەویستی – ملکەچی – مەزنی و گەورەیی ...هتد)

سێیەم : گوفتـاری زمـان بوگـوتنی شـایەتومان و زیکـرد و مەدح و حەمـد شـوکریی و داواکردنی هاوکاری بەتەنها لە اللە سبحانە وتعالی.

چوارەم : کردەوەی لاشە وەك نوێژ و ڕۆژوو و سەربڕین...هتد

تەوحیـدی پەرسـتراویەتی هەنـدێکی بە بیروبـاوەڕە، هەندێکیشیـ بە گوفتـار و کردەوەیە.
{بۆیە نوێژنەکەر کافرە بە بەڵگەی قورئان و فەرموودە و ئیجماعی هاوەڵان و زانایان ئەگەر باوەڕیشیـ پـێی هەبێـت لەبەر ئەوەی بەشی چـوارەمی بەجێ نەهێنـاوەکە

**لاشــەیە واتە تەوحیــدی پەرســتراویەتی تەواو نــیە، یــان بڵێــین ئەم تەوحیــدەی تێدانیە}.**

**بۆیە موسڵمانانی ئازیز ئێمە دەبێ زۆر ئاگاداربین کەوا ( الولاء والبراء ) دۆستایەتی و ڕق لێبوونەوە دەچێتە ناو تەوحیدی پەرستراویەتی، تەوحیدی پەرستراویەتی تەواو نیە تا ئەوکاتەی خاوەنەکانیان خۆشنەوێت(موسڵمانان) وە دەبێت دژایەتی کافر و موشریکانیش بکەین.**

**وەك پێغەمبەر إبراهیم { علیە السلام } بە گەلەکەی خـۆی وت: { إِنَّا بُرَآءُ مِنكُمْ وَمِمَّا تَعْبُدُونَ مِن دُونِ اللَّهِ كَفَرْنَا بِكُمْ وَبَدَا بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمُ الْعَدَاوَةُ وَالْبَغْضَاءُ أَبَدًا حَتَّىٰ تُؤْمِنُوا بِاللَّهِ وَحْدَهُ } الممتحنة – ٤، واتە: ئێمە بەرین لەئێوەو لەو شتانەش کە دەیپەرستن لەجیاتی الله، ئێمە باوەڕمان بەو دین و ئاینەی ئێوە نیە، ئیتر دوژمنایەتی و ڕقەبەرایەتی لەنێوانماندا بەرپابوو تا ئەوکاتەی کە بەتاك و تەنها باوەڕ بە الله دێنن.**

**بۆیە ئاگاداربە بابەتی ( الولاء والبراء ) زۆر گرنگە، الله تعالی دەفەرمووێت : { يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَتَّخِذُوا الْيَهُودَ وَالنَّصَارَىٰ أَوْلِيَاءَ ۘ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَاءُ بَعْضٍ ۚ وَمَن يَتَوَلَّهُم مِّنكُمْ فَإِنَّهُ مِنْهُمْ ۗ إِنَّ اللَّهَ لَا يَهْدِي الْقَوْمَ الظَّالِمِينَ } المائدة – ٥١.**
**واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە جولەکەو گاور مەکەنە یارو یاوەرو پشتیوانی خۆتان ئەوانە هەندێکیان پشتیوان و پشتگیری یەکترن، ئەو کەسەی پشت بەوان ببەستێت، ئەوە هەر لەوانە و (حسابی ئەوانی بۆ دەکرێت) بەڕاستی الله هیدایەتی قەومی ستەمکار نادات.**
**وە دەبێ بزانیت کەوا ئەگەر الولاء والبراء ت جێبەجێ نەکرد ئوا نوێژ و ڕۆژوو و بەخشینی ماڵ و سامان سودی نابێت بۆت.**

وەك عبد الله ی کوڕی عومەر رضي الله عنه دەفەرمووێت : { **والله لو صمت النهار لا أفطره وقمت الليل لا أنامه وأنفقت مالي في سبيل الله ثم أموت وليس في قلبي حب لأهل الطاعة وبغض لأهل المعصية ما نفعني ذلك شيئا** } [ فيض القدير للمناوي ]

واته: سوێند بە الله ئەگەر ڕۆژ بە ڕۆژوو بم و نەیشکێنم، وە شەویش بەردەوام شەونوێژ بکەم و نەخەوم وە ماڵ و سامانی خۆم لەپێناو الله ببەخشم ئینجا بمرم و دڵم هیچ خۆشەویستیەکی تیانەبێت بۆ ئەو کەسانەی کە گوێڕایەڵی الله دەکەن و هیچ ڕق و قینێکی تیانەبێت بەرامبەر ئەو کەسانەی سەرپێچی الله دەکەن ئەوا هیچ سودی نابێت بۆم.
کەواتە بۆمان دەرکەوت گەر بەتەنها بەدڵ کافرت خۆشبوێت کافر دەبیت چ جای ئەوی دوعای بۆ بکەیت و بەباشە باسیان بکەیت و پشتگیریان بکەیت و هاوکاریان بکەیت و بە سەرکەوتنیان خۆشحاڵ بیت، بەپێچەوانەشەوە ڕقت لە موسڵمانان و موجاهیدان بێت دڕایەتیان بکەیت و بە سەرکەوتنیان دڵتەنگ بیت، بێ شك و گومان ئەوانە گشتی کوفرە و خاوەنەکەی کافر دەبێتەوە.

**سێیەم : ناو و سیفاتە بەرزەکان { الأسماء والصفات } :**

**هو إفراد الله سبحانه وتعالى بأسمائه وصفاته ( بریتیە لە بەتاکدانانی الله لەناو و سیفاتە بەرزەکانی وە جێگیرکردنی بەو شێوەیەی کە هەیەو هاتووە) الله تعالى دەفەرمووێت : { لَيْسَ كَمِثْلِهِ شَيْءٌۖ وَهُوَ السَّمِيعُ الْبَصِيرُ } واتە: هیچ شتێك هاوشێوەی ئەو نیەو ئەو زاتە بیسەر و بینەرە.**

**ڕوونکردنەوەیەك : هەموو ناوەکانی الله سیفاتن، بەڵام هەموو سیفاتێك ناو نین، بۆ نمونە یەکێك لەسیفاتەکانی الله ئەوەیە کە پێدەکەنێت، بەڵام ناکرێت بڵێین یەکێك لەناوەکانی الله تعالى ئەوەیە کە ( مضحك ) ـە والعیاذ بالله، بەڵکو تەنها سیفەتی وایە.**

**ئیمامی مالیك رحمه الله بنچینەو قاعیدەیەکی زۆر جوانی بۆ ئەم شتە داناوە کاتێك پیاوێك پرسیاری لێکرد ئەی ئیمام الله چۆنە لەسەر عەرش؟ ئیمامی مالیك فەرمووی : باوەڕهێنان بەناو و سیفاتە بەرزەکانی الله واجبە و پرسیارکردن دەربارەی بیدعەیە، چونکە باس نەکراوە نە لە قورئان و نە لە سوننەت.**
**بۆیە دەبێ ناو و سیفاتەکانی الله بەو شێوەیە جێگیر بکەین کە هەیە بەبێ ئەوەی [ تعطیل – تشبیه – تکیف – تمثیل – تحریف ] بکەین.**

**تعطیل: واتە پەکخستن کە جەهمیەکان لەمەدا تێکەوتوون و سیفاتەکانی الله تعالى یان پەکدەخست واتە پێیان وابوو الله تعالى ناو و سیفاتی نیە.**

**ئیبن قەییم رحمه الله لە – الجواب الكافي – دەفەرمووێت : { شیرکی پەکخستن(التعطیل) پیسترین جۆری شیرکە }**

**تكيف : بريتيه لەچۆنيەتی، بۆ نمونه بڵێی ( کاتێ الله تعالى دێته ئاسمانی دونیا بەو شێوەیە دێت ) والعياذ بالله نابێ وا بگوترێت چونکه الله تعالی هیچ هاوشێوەیەکی نیەو مرۆڤ بۆی هیه چۆنیەتی بۆ بڕیاربدات.**

**تحريف: واته بەبێ گۆڕینی ماناکەی، واته مانای ناو و سیفاتەکانی الله نەگۆڕدرێت.**

**تشبيه { الخالق بالمخلوق } : دروستکاریان کردۆته هاوشێوەی دروستکراو، واته کەسێك بکەنه نێوەند لەنێوان خۆیان و الله یاخود بڵێن الله کوڕی هەیه وەك مرۆڤەکان ( والعياذ بالله )**
**لێرەدا تەشبیهمان کردووه و چواندوومانه به مرۆڤەکان ( والعياذ بالله )**

**تمثيل : بەپێچەوانەوە دروستکراویان کردە هاوشێوەی دروستکار (المخلوق بالخالق) ئەمەیان زۆرتره لەوەی تر (تشبيه) بۆیه هاوشێوەی دەکات له ( الألوهية – الربوبية ) ئەوە موشریکه باوەڕی وایه مردوو یان زیندوو بەهانایان دێت، عیلم و زانستی غەیب دەزانێت، بوونەوەر بەڕێوەدەبات، سود و زیانی پێدەگەیەنێت، حەڵاڵ حەرام دەکات، تەشریع(یاسادانان) و تەحکیم دەکات ( واته بڵێی فلانه کەس دەتوانێت جیهان بەڕێوه ببات وەك الله والعياذ بالله، یان فلانەکەس دەتوانێت تەحکیم بکات لەکاتێکدا حوکم تەشریع تەنها بۆ الله یه )**
**زۆربەی فیرقەو گرووپه گومڕاکان له أسماء و صفات تێکەوتبوون بۆیه دەبێت ئاگادار بین دەربارەی.**
**بەڕێزان با هەوڵی فێربوونی ئەم زانسته پیرۆزه بدەین، تاکو سەربەرزی دونیاو قیامەت بین و خەڵکیش فێربکەین، چونکه وەك دەبینین ئەوەی ئەمڕۆ خەڵك خۆی لێ لاداوە ئەم عیلمەیەکە زۆرێك بێئاگان.. والله المستعان.**

# بەشی چوارەم

## باسی یەکەم | طاغوت چییە؟

لا إله إلا الله پێك دێت لە دوو گۆشە، [ النفي – الإثبات ]

یەکەم : ماناى النفي ( لا إله )
واتە نەفی کـردن و ڕەتکـردنەوە و بـاوەڕ نەبـوون بەو شـتانەی کە جـگە لە اللّٰه دەپەرسترێن.

- کافر بوون پێیان و بەرائەت کردن لەو شتانەو لەو کەسانەش کە دەیانپەرستن { وەك طاغوت و سەربازەکانی و خۆشەویستانی }

دووەم: الإثبات ( إلا الله )
واتە: چەسپاندن و باوەڕ بوون بە اللّٰه تعالی (تەنیا باوەڕ بە اللّٰه بهێنین)
بەڕێزان دەبینین پێش باوەڕ بوون بە اللّٰه تعالی دەبێت یەکەمجار کوفر بە طاغوت و ئەهلی طاغوت بکەیت بۆ ئەوەی ببیت بە کەسێکی کە اللّٰه تعالی دەربارەیان دەفەرموێت : { فَمَن يَكْفُرْ بِالطَّاغُوتِ وَيُؤْمِن بِاللَّهِ فَقَدِ اسْتَمْسَكَ بِالْعُرْوَةِ الْوُثْقَىٰ } البقرة – ٢٥٦.
واتە: [ هەرکەسێک کوفر بەطاغوت بکات و باوەڕی دامەزراوی بە اللّٰه هەبێت بێگومان ئەو کەسە دەستی گرتووە بە بەهێزترین هۆکاری ڕزگار بوونەوە ( واتە لا إله إلا الله )
بۆیە بابەتی طاغوت زۆر گرنگە دەبێ بزانین ماناو جۆرەکانی چین و هەروەها چۆن کوفری پێ دەکرێت.

## ماناى طاغوت چيه؟

ئيبن قەيـيمى جەوزى رحمـه الله تعـالى دەربـارەى طـاغوت دەفەرمووێـت: { كُلُّ مَا تَجَـاوَزَ بِـهِ الْعَبْـدُ حَـدَّهُ مِـنْ مَعْبُـودٍ أَوْ مَتْبُـوعٍ أَوْ مُطَـاعٍ } واتە: هەرشـتێك كە بەنـدە بەهـۆيەوە لەسـنوور دەربچێت لە { كەسى پەرسـتراو و شـوێن كەوتـوو و گـوێڕايەڵى بۆكراو }

[ ئايا طاغوت لەبەندايەتى – شوێنكەوتن ماناى چيه؟ ]

لە وەڵامـدا دەڵێين : طـاغوت لەبەنـدايەتى كـردن بـۆ غەيـرى الله تعـالى واتە شـتێك لەغەيـرى الله تعـالى ببەرسـترێت جـا مـرۆڤ بێـت يـان مـردوو يـان زينـدوو، قەبـر، دارێك، بتێك، ئاژەڵێك وەك مانگا يان هەر ئاژەڵێكى تر...هتد، كاتێ باسى پەرستنى مــرۆڤ دەكەيــن ئەوا دەبێ بــزانين كە بەمەرجێ دەبێــتە طــاغوت ئەگەر هــاتوو كەســەكە خــۆى ڕازى بێـت بەوەى كە دەپەرسرێـت و عيبادەتەكـانى بـۆ دەكرێـت چونكە پێغەمبەر عيسا عليه السلام وەك پەرستراوێك دەيانپەرست والعياذ بالله بەڵام ئەو خۆى ڕازى نەبوو بەوەى كە ببەرسترێت.

هەروەهـا دەبێ ئاگادار بـين كە پەرسـتن تەنهـا ئەوەنـيە سـوجدەى بـۆ ببرێت (بەڵكـو شوێنكەوتن – خۆشويستن – داواكردن – پشت پێ بەستن – گوێڕايەڵى كردن..هتد) گشتى ئەمانە پەرستنە ئاگادار بن.
پێغەمبەرمان ﷺ دەفەرمووێت : ( داواكردن(دوعا) عيبادەت و پەرستشە )
الله تعالى دەفەرمووێت : { وَالَّذِينَ اجْتَنَبُوا الطَّاغُوتَ أَنْ يَعْبُدُوهَا وَأَنَابُوا إِلَى اللَّهِ لَهُمُ الْبُشْرَى فَبَشِّرْ عِبَادِ } الزمر – ١٧

**واتە: ئەو کەسانەی کە خۆیان لەپەرستنی بت و طاغوتەکان دوور خستۆتەوە، وە گەڕاونەتەوە بۆ لای الله تعالی و ڕوویان لەعیبادەتی الله کردووە، دەسا مـوژدەی بەهەشت بەوانە بدە.**

**کەواتە بۆمـان دەردەکەوێـت کە دەبێـت هەرچی پەرسـتنە بـۆ الله تعـالی ئەنجـامی بدەین و تەنها ئەو شایانی پەرستنە.**

**2- طـاغوت لەشـوێنکەوتندا : واتە شـوێن کەوتـنی کەسـانێك و گـوێڕایەڵی کردنیـان لەهەموو شتێك گەر پێچەوانەی دینیش بێت وەك شوێن کەوتنی زانا گومڕاکان کە حەڵاڵ حەڕام دەکەن و حەڕامیش حەڵاڵ دەکەن و بەئارەزووی خۆیان دەستکاری دین دەکەن.**

**هەروەها یاساکانی طاغوت لەدیموکڕاسی و یاسا داهێنراوەکان، دەبێ ئینسان بزانێت کە یاسادانان تایبەتە بە الله تعالی.**

**الله تعـالی دەفەرمووێـت : {اتَّخَـذُوا أَحْبَـارَهُمْ وَرُهْبَـانَهُمْ أَرْبَابًـا مِـنْ دُونِ اللَّهِ} واتە: جولەکەو گاور قەشەو حاخامەکانی خۆیان کردبوو بە پەروەردگاری خۆیان لەجیاتی الله.**

**ملکەچ و فەرامن بەردارینان ئەوانیش بە ئارەزووی خۆیان حەڵاڵ حەڕام دەکەن و حەڕامیش حەڵاڵ دەکەن.**

**دەبینـین کە ئەم طاغوتـانە زۆرن ئەوانەی بەنـاوی دیـن دەسـتکاری دیـن دەکەن و حەڵاڵ حەڕام دەکەن و حەڕامیش حەڵاڵ دەکەن، بۆیە دەبێ کوفریان پێ بکەین و گوێڕایەڵیان نەبین.**

**چـونکە بەڕاسـتی ئەوانەی شـوێن ئەمـانە بکەون ئەوا جـگە لە زەرەرمەنـدی هـیچی تریان بۆ نامێنێتەوە.**

## جۆرەکانی طاغوت:

طاغوت جۆری زۆرە بەڵام سەرەکی ترینیان 5 جۆرن:

1- شەیطان { ئیبلیس }.

2- ئەو کەسەی شەرعی الله دەگۆڕێت و خۆی یاسا دادەنێت.

3- حوکم کردن بەیاسای تر جگە لەشەریعەتی الله.

4- ئەوکەسەی بانگەشەی زانستی پەنهانی ( عیلمی غەیب ) دەکات.

5- ئەوکەسەی لەجیاتی الله دەپەرسرێت و بە پەرستنەکەش ڕازییە.

1- شەیطانی بانگکەر بۆ پەرستنی غەیری الله، هەروەك الله تعالی دەفەرمووێت : {۞ أَلَمْ أَعْهَدْ إِلَيْكُمْ يَا بَنِي آدَمَ أَن لَّا تَعْبُدُوا الشَّيْطَانَ ۖ إِنَّهُ لَكُمْ عَدُوٌّ مُّبِينٌ} [یس : ٦٠] واتە: ئەی نەوەی ئادەم، مەگەر من پێم ڕانەگەیاندن کە شەیتان نەپەرستن، چونکە ئەو بەڕاستی دوژمنی ئاشکراتانە.

بۆیە بەڕێزان دەبینین کەسانێك خەریکی پەرستنی شەیطانن و بەرزی دەنرخێنن (پەنا بە الله) لەکاتێکدا ئامانجی ئەوەیە کە دوورمان بکاتەوە لە الله تعالی، بەڵام ئەوەی خۆی تەسلیمی الله کردبێت ئەوە بێگومان الله دەیپارێزێت و سەریدەخات.

**2- دەسەڵاتدارێك یان حاكمێك كە شەریعەتی الله بگۆڕێت**

**الله تعالی دەفەرمووێت : {أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ يَزْعُمُونَ أَنَّهُمْ آمَنُوا بِمَا أُنزِلَ إِلَيْكَ وَمَا أُنزِلَ مِن قَبْلِكَ يُرِيدُونَ أَن يَتَحَاكَمُوا إِلَى الطَّاغُوتِ وَقَدْ أُمِرُوا أَن يَكْفُرُوا بِهِ وَيُرِيدُ الشَّيْطَانُ أَن يُضِلَّهُمْ ضَلَالًا بَعِيدًا} [النساء : ٦٠]**

**واتە: ئایا نەترڕوانیووەتە ئەو كەسانەی لافی ئەوە لێ دەدەن گوایە بەڕاستی باوەڕیان هێناوە بەوەی كە بۆ تۆ ڕەوانەكراوە و بەوەش كە پێش تۆ ڕەوانەكراوە (بۆ پێغەمبەران)! كەچی دەیانەوێت حوكم ببەنەوە بۆ لای طاغوت تا دادوەریان لە نێواندا بكەن و چارەسەری كێشەكانیان بكەن، لەكاتێكدا بە ڕاستی فەرمانیان پێدراوە كە باوەڕیان بە (طاغوت) نەبێت، شەیتانیش دەیەوێت گومڕایان بكات بەگومڕاییەكی دوورو بێ سنوور.**

**لەم ئایەتەدا ئەوەمان بۆ ڕوون دەبێتەوە كە ئەو كەسانەی بەخۆیان دەڵێن ئیماندار لەهەمان كاتدا حوكم دەبەنەوە بۆ لای طاغوت ئەوا بڕوادار نین چونكە الله تعالی فەرمانی كردووە كە كوفر بە طاغوت و ئەهلی طاغوت بكەین.**

**3- ئەوەی حوکم بەغەیری ئەو شتە دەکات کە اللە دایبەزاندووە.**

**اللە تعالى دەفەرمووێت: {وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَا أَنزَلَ اللَّهُ فَأُولَـٰئِكَ هُمُ الْكَافِرُونَ} [المائدة : ٤٤]**

**واتە: هەرکەسێك حوکم بەوە نەکات کە اللە دایبەزاندووە، ئەوا ئەو کەسانە کافر و بێ باوەڕن.**

**شێخ عبد الرحمن بن محمد بن قاسم رحمه اللە فەرموویەتی:**

**(وەك ئەو کوسەی حوکم بەیاسا جاهیلیەکان دەکات یان یاسا نێودەوڵەتیەکان، بەڵکو هەرکەسێك حوکم بکات بەغەیری ئەوەی کە اللە دایبەزاندووە ئیتر یاسا بێت یان غەیری ئەو، ئەوا طاغوتەو لەگەورەترینی طاغوتەکانە)**

**نمونە بۆ ئەم خاڵە زۆرە لەوانە [سەرۆکەکانی هەموو وڵاتە بەناو ئیسلامیەکان - سەرۆکەکانی حیزبە عەلمانیەکان - سەرۆکەکانی حیزبە بەناو ئیسلامیەکان...هتد]**

**4- ئەوەی بانگەشەی زانینی عیلمی غەیب دەکات جگە لە الله.**

**الله تعالى دەفەرمووێت : {عَالِمُ الْغَيْبِ فَلَا يُظْهِرُ عَلَىٰ غَيْبِهِ أَحَدًا (٢٦) إِلَّا مَنِ ارْتَضَىٰ مِن رَّسُولٍ فَإِنَّهُ يَسْلُكُ مِن بَيْنِ يَدَيْهِ وَمِنْ خَلْفِهِ رَصَدًا (٢٧)} [الجن : ٢٦-٢٧]**
**واتە: ئەو زاتە زانای نهێنی و شاراوەکانە، کەسیش لە نهێنی و شاراوەکانی ئاگادار ناکات.**
**مەگەر بۆ پێغەمبەرێك الله خۆی ڕازی بێت (بەوەی هەندێ نهێنی بزانێت)، ئەو کاتە فریشتە دەکاتە پاسەوانی لە بەرو پشتەوە (تا پەری و شەیتانەکان نەتوانن زەفەری پێ بەرن).**

**هەروەها دەفەرمووێت : {۞ وَعِندَهُ مَفَاتِحُ الْغَيْبِ لَا يَعْلَمُهَا إِلَّا هُوَ ۚ وَيَعْلَمُ مَا فِي الْبَرِّ وَالْبَحْرِ ۚ وَمَا تَسْقُطُ مِن وَرَقَةٍ إِلَّا يَعْلَمُهَا وَلَا حَبَّةٍ فِي ظُلُمَاتِ الْأَرْضِ وَلَا رَطْبٍ وَلَا يَابِسٍ إِلَّا فِي كِتَابٍ مُّبِينٍ} [الأنعام : ٥٩]**
**واتە: کلیلی هەموو شاراوەکان و زانینی هەموو نهێنیەکان بەدەست الله یە و هەر لای ئەوە، کەس نایانزانێت جگە لەو زاتە هەرچی لەسەر وشکانیە (لە گیاندارو بێ گیان و گیاو دارو زیندەوەرانی وردو درشت لەسەر زەوی و لە توێی خاکدا) الله پێی دەزانێت، هەروەها هەرچی لە دەریاکانیشدا هەیە (لە زیندەوەری هەمەجۆرو ماسی سەیرو سەمەرە) ئاگای لێیەتی و هیچ گەڵایەک ناکەوێتە خوارەوە الله پێی نەزانێت، هەروەها دەنکێک یان تۆوێک لە تاریکیەکانی زەویدا نیە، ئەو دەنکە چ شێدار بێت یان وشک بێت، هیچ شتێک نیە لە خوا پەنهان بێت و لە (لوح المحفوظ) دا، یاخود لە دۆسیە و دەزگای تایبەتیدا تۆمار نەکرابێت.**

کەواتە لەو ئایەتەدا بۆمان دەردەکەوێت کە تەنها الله زانایە بە شتە شاراوەکان، وە هەرکەسێکیش بانگەشەی ئەوە بکات کە غەیب دەزانێت یان عیلمی غەیبی پێیە ئەوا ئەو کەسە طاغوتە و پێویستە تەکفیر بکرێت (بەکافر بزانرێت).

**ڕوونکـــردنەوەیەک** / کاتێك لەکەناڵەکان دەڵێن بەیانی کەش و هەوا سـاردە یان گەرمە یـان بارانـاوییە، لـێرەدا دەبێ بوترێـت والله أعلـم ( الله زانـاترە ) نەك یەقیـنی تەواو هەبێت چـونکە ئەمـانە پێشـبینیان کـردووە نەك سـەدا سـەد دڵنیابن، بـۆیە زۆرێـك دەبینـین کە بەیـانی دەبێـتە بـاران یـان سـارد دەبێـت دەڵـێن [ئەی نەتـدیت لەکەش و هەوا وتی بارانە بـۆچی جلی گەرمت نەپۆشـیوە] لێرەدا زانیاریەکەیان بـۆ خاوەنی کەناڵەکان و پێشبینی کەران بردەوە نەك دەسـەڵاتی الله کە خـۆی زانایە بەم شتانە.
بـۆیە بەڕێـزان دەبێ ئاگـادار بـین کە چی دەڵێـین و چی دەکەیـن، وە ئەوەی گـرنگە فێربوونی ئەو بابەتانەیە بۆ ئەوەی دوور بین لەهەموو جۆرە شیرك و کوفرێك - پەنا بە الله.-

5- ئەوەی دەپەرسترێت لەغەیری الله و ڕازییە بەو پەرستنە.

الله تعالی دەفەرمووێت : {۞ وَمَن يَقُلْ مِنْهُمْ إِنِّي إِلَـٰهٌ مِّن دُونِهِ فَذَٰلِكَ نَجْزِيهِ جَهَنَّمَ ۚ كَذَٰلِكَ نَجْزِي الظَّالِمِينَ} [الأنبياء : ٢٩]
واتە: خۆ ئەگەر یەکێکیان (لە خۆی غەڕرا بێت) بڵێت: بەڕاستی منیش پەرستراوم بێجگـە لـەو، ئـەوە پاداشـتی دەدەینـەوە بـە دۆزەخ، هـەر بـەو شـێوەیـە پاداشـتی ستەمکاران و یاخیەکان دەدەینەوە.

بۆیە هەرکەسێك بپەرسترێت لەجیاتی الله ئەویش پێی ڕازی بێت ئەوا بێ شك و گومان طاغوتە، لەئێستادا دەبینین خەڵك سەرکردەکان دەپەرستن کەچی هیچ هەڵوێستێکیان نیە بۆ ئەم پەرستنە.
وە بزانە کە مرۆڤ هیچ کات ئیماندار نەبێت تاکو کوفر بەطاغوت نەکات، الله تعالی دەفەرمووێت : {فَمَن يَكْفُرْ بِالطَّاغُوتِ وَيُؤْمِن بِاللَّهِ فَقَدِ اسْتَمْسَكَ بِالْعُرْوَةِ الْوُثْقَىٰ لَا انفِصَامَ لَهَا ۗ وَاللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ} [البقرة : ٢٥٦]
واتە: جا ئەوەی کافربێت بەطاغوت و باوەڕ بە الله بهێنێت ئەوە بەڕاستی دەستی گرتووە بە توندترین هۆکاری ڕزگاربوون ( کە بریتیە لە لا إلـه إلا الله ) کە هیچ پسانێکی بۆ نیە، هەروەها بێگومان الله بیسەر و زانایە.

شێخ عبد الله أبا بطين رحمە الله دەفەرمووێت : طاغوت هەموو پەرستراوێکە لەجیاتی الله، وە سەری هەموو گومڕاییەکە، بانگەشە دەکات بۆ باطل(پوچەڵی و ناحەق) وە دەیڕازێنێتەوە، ئەوانەش دەگرێتەوە کە خەڵك کردوونی بەحاکم بۆ ئەوەی حوکم لەنێوانیان بکات بەئەحکامە جاهیلیەکان کە پێچەوانەی حوکمی الله و پێغەمبەرەکەین ﷺ، هەروەها طاغوت ساحیر و کاهین و بتەکانیش دەگرێتەوە.

بەڕێزان ئەمانە جۆرەکانی طاغوت بوون، بۆیە لەهەر یەکەیان بەڵگە هەیە بۆ ئەوەی ئێمە گومانمان نەمێنێت کە ئیتر دەبێت کوفر بەطاغوت بکەین بۆ ئەوەی داخلی ئیسلام بین و ببین بەکەسێکی موسڵمان.

## چۆنیەتی کوفرکردن بەطاغوت :

کاتێك ئێمە ماناو جۆرەکانیمان زانی دەبێ ئەوەش بزانین کە چۆن کوفری پێ بکەین؟

لەم بارەیەوە شێخ محمد بن عبد الوهاب رحمه الله دەفەرمووێت:
پێویستە بیروبڕوات وابێت کە پەرستش بۆ غەیری الله باطلە، وە تەرکی بکەیت، وە ڕقت لێی بێت وە تەکفیری ئەهلەکەشی(شوێنکەوتووانی) بکەیت.

الله تعالى دەفەرمووێت : {قَدْ كَانَتْ لَكُمْ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ فِي إِبْرَاهِيمَ وَالَّذِينَ مَعَهُ إِذْ قَالُوا لِقَوْمِهِمْ إِنَّا بُرَآءُ مِنكُمْ وَمِمَّا تَعْبُدُونَ مِن دُونِ اللَّهِ كَفَرْنَا بِكُمْ وَبَدَا بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمُ الْعَدَاوَةُ وَالْبَغْضَاءُ أَبَدًا حَتَّىٰ تُؤْمِنُوا بِاللَّهِ وَحْدَهُ} [الممتحنة : ٤]
واتە: ئەی ئیمانداران، بەڕاستی لە ئیبراهیم و ئەوانەی کە لەگەڵیدا بوون نموونەیەکی چاکتان خراوەتە بەرچاو، کاتێك کە بە قەومەکەی خۆیانیان وت: دوای ساڵەها بانگەواز، ئێمە بەرین لە ئێوە و لەو شتانەش کە لەجیاتی الله دەیپەرستن، ئێمە باوەڕمان بەو دین و ئاینەی ئێوە نیە، ئیتر دوژمنایەتی و ڕقەبەرایەتی لەنێوانماندا بەرپا بووە تا ئەو کاتەی کە باوەڕ بە الله ی تاك و تەنها دەهێنن.

لەم ئایەتە پیرۆزە چەند شتێکمان بۆ ڕوون دەبێتەوە:
1 - الله تعالى نمونەی ئیبراهیم علیه السلام باسدەکات وەك بەرچاو ڕوونی و بەرائەتکردن و کافر بوون پێیان.

2 - ئەو بەرائەتی لەقەومەکەی کرد دوای ساڵەها بانگەواز کەچی هەر باوەڕیان نەهێنا ( ئەو قەومەش باوکی ئیبراهیمی تێدابوو ) کەواتە گرنگ نیە ئەوکەسەی

کوفردەکات دایك یان باوك بێت بڵێ : دڵم نایە تەکفیریان بکەم و بەکافریان بزانم، نەخێر هەرکەسێ کوفری کرد دەبێ تەکفیری بکەیت(بەکافری بزانیت) ئەگەرنا مانای ئەوەیە کە ئایەت و فەرموودە بەدرۆ دەخەیتەوە کە ئەوانی کافر کردووە.

3- دوای بەرِائەتکردن ئیتر دوژمنایەتی و رِقەبەرایەتی لەگەڵیان هەیە تائەوکاتەی باوەرِ دەهێنن و الله بەتاك و تەنهایی دەپەرستن، بۆیە دەبێ دوژمنایەتی و رِقەبەرایەتیمان هەبێت لەگەڵیان.

الله تعالی دەفەرمووێت : {وَلَقَدْ بَعَثْنَا فِي كُلِّ أُمَّةٍ رَّسُولًا أَنِ اعْبُدُوا اللَّهَ وَاجْتَنِبُوا الطَّاغُوتَ} [النحل : ٣٦]
واتە: سوێند بە الله ئێمە بۆ هەموو گەل و ئوممەتێك پێغەمبەرێکمان ناردووە کە فەرمانیان پێ بکات و پێیان رِابگەیەنێت کە الله بپەرستن و طاغوت لەخۆیان دوور بخەنەوە.

هەروەها الله تعالی دەفەرمووێت : {وَالَّذِينَ اجْتَنَبُوا الطَّاغُوتَ أَن يَعْبُدُوهَا وَأَنَابُوا إِلَى اللَّهِ لَهُمُ الْبُشْرَىٰ ۚ فَبَشِّرْ عِبَادِ} [الزمر : ١٧]
واتە: جا ئەوانەی کە خۆیان دوورە پەرێز گرتووە لە هەموو ئەو شتانەی خەڵکی دەیپەرستن، جگە لە الله ی پەروەردگار و بەتەوبە و پەشیمانیەوە گەرِاونەتەوە بۆ لای الله، مژدەی سەرکەوتن و سەرفرازی و بەختەوەری و کامەرانی بۆ ئەوانەیە، دە مژدە بدە بەو بەندانەم.

بەرِێزان ئەم ئایەتانە بەڵگەن لەسەر واجبێتی دوورە پەرێزی کردن لەطاغوت وە دەبێ بزانین کە دوورە پەرێزی مانای ئەوەیە رِقت لێی بێت و لەدڵەوە دژایەتیان

**بکەیت، وە بەزمانیش ناشرینیان بکەیت تاکو بەڕائەتکردنت بسەلمێت لەلایەن اللە تعالی.**

**بۆیە بەڕێزان دەبێ زۆر ئاگادار بین کە گوێڕایەڵی کێ دەکەین؟**

**وە شوێنی کێ دەکەوین؟**

**ئایا ئەوەی شوێنی دەکەوین عەقیدەو بیروباوەڕی خۆی لەئەهلی سوننەو جەماعە وەرگرتووە؟**

**یان لەکەسێکی نەزان؟**

**بۆیە ئێمە بەفێربوونی ئەم بابەتانەو شارەزابوون تیایدا دەتوانین بیانناسین کە چۆنن، داواکارین لە اللە ڕێگای ڕاستمان نیشان بدات و بەدوور بین لەهەموو جۆرە طاغوتێکی ئەم سەردەمە.**

# بەشی پێنجەم

## باسی یەکەم | کێن ئەوانەی بوونەتە ئاستەنگ بۆ ڕێگەی تەوحید؟

بەڕێزان لێرەدا باس لەوانە دەکەین کە بوونەتە ئاستەنگ بۆ ڕێگەی تەوحید کە بریتین لەمانە:

1. حیزبە علمانیەکان

2. حیزبە بەناو ئیسلامیەکان

3. مەلا دین فرۆشەکان

1- حزبە علمانیەکان : ڕێچکەیەکی کوفریە کەدین لەسیاسەت و ئابووری جیادەکەنەوە و دەڵێن دین تەنها لەمزگەوتە [ لەڕاستیدا علمانیەکان دین لە هەموو ژیان جیادەکەنەوە و ڕازی نین دینی ئیسلام وەکو خۆی لە مزگەوتیش بێت وەکو علمانیەکانی کوردستان [پارتی ـ یەکێتی ـ گۆڕان ـ سۆشیالیستی ... هتد] هەموویان گەورە و بچووکیان ژن و پیاویان کورد و عەرەب و عەجەم هەموویان کافرن ، وە هەموو دارودەستەکانیان لەئاسایش و پێشمەرگە و مەدخەلی و هەواڵگیری و پاراستن و پۆلیس و پۆلیسی هاتوچۆ و کەرت و لق و مەڵبەندەکانیان هەر هەموویان کافرن با بڵێن {لا إلە إلا الله محمد رسول الله} وە نوێژ بکەن و بەڕۆژوو بن .... هتد، ئەمانە هیچ سوودی نییە بۆیان چونکە ئەمانە کۆمەڵێ کوفر و شیرکیان هەیە لەگرینگترینیان(پەرلەمانە).

ئەوانە هەڵساون بەدروست کردنی جێگایەک بەناوی ( پەرلەمان ) کە هەموو حوکمێکیان خستۆتە بەردەستی خەڵکی نەزان و نەفام بەئارەزوو و ویستی خۆیان بڕیار لەسەر دەدەن کەئەمەش کوفرێکی ئاشکرا و ڕوونە چونکە الله تعالی ئەو قورئانەی بۆئەوە ناردووە تا لە نێوان خەڵکی حوکمی پێبکرێ ، وەک دەفەرموێ (وَأَنِ ٱحۡكُم بَيۡنَهُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ)[سورة المائدة ٤٩]

واتە : (کاتێک هەندێک لە زاناکانی جوو، هاتن بۆ لات تا داوەریی بکەی لە نێوانیاندا)، داوەری بکە بەو بەرنامەیە (قورئانە)ی کە لەلایەن الله بۆت دابەزیووە.

کەواتە دەبێ حوکم بەو قورئانە بکەین کە الله دایبەزاندووە نەک دەستورێکی داهێنراو ، وە ئەوان دژایەتی ئیسلام و موجاهیدان و حوکمی الله دەکەن و پێیان وایە کەئایینی ئیسلام کاتەکەی بەسەرچووە و ناکرێت لەم سەردەمەی کە تێیداین بەکاربهێنرێ و حوکمی پێبکرێ.

ئایە چی لەوە کوفرترە کە دژایەتی حوکمی الله دەکەن لەکاتێکدا الله تعالی ئەفەرموێ : (الْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ وَأَتْمَمْتُ عَلَيْكُمْ نِعْمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ الْإِسْلَامَ دِينًا) المائدة - ٣.

واتە : وا لەئەمڕۆوە بەرنامە و ئایینەکەتانم بەپایان گەیاند ، واتە :. لەڕووی عقیدە و جیهادەوە ، لەبارەی حەڵاڵ و حەرامەوە هەموو شتێکم بۆ تەواو کردن ، وەنیعمەت و بەخششەکەی خۆمم بۆ تەواو کردن و سەرم خستن بەسەر دوژمنانتانا و ڕێنماییم کردن بۆ ڕێگەی ڕاست ئیتر نە پێویست بەپێغەمبەرێکی تر هەیە و نەقورئانێکی دیکە ، ئیسلامیشم بەبەرنامە و ئایین بۆ هەڵبژاردن و نابێ هیچ کاتێک لێی لابدەن.

کەواتە بۆمان دەرکەوت کە قورئان کامڵە و گۆڕینی سەردەم کار لە قورئان ناکات چونکە بۆ هەموو کاتێک و سەردەمێک گونجاوە.

وە هەروەها یەکێکی تر لەکوفر و شیرکەکانیان ئەوەیە کە ئەوان دەیانەوێ تەنیا خۆیان بڕیار بدەن بەهەواو ئارەزووی خۆیان لەکاتێکدا الله تعالى ئەفەرموێ:. (أَلَا لَهُ ٱلۡخَلۡقُ وَٱلۡأَمۡرُۗ ) سورة الأعراف ٥٤.
واتە: چاکیش بزانن کەدروست کردن و تەگبیر و فەرمانی بۆ بەڕێوبردنی هەموو بونەوەر هەر بەدەستی ئەوە . واتە بۆهیچ حزب و لایەنێک نییە کە بڕیار بدات و بەئارەزووی خۆی فەرمان دەربکات وە تەنیا الله بۆی هەیە فەرمان بکات چونکە باشترین و چاکترین حاکمە.
هەروەک الله تعالى ئەفەرموێ :. (وَهُوَ خَيۡرُ ٱلۡحَٰكِمِينَ) یونس – ١٠٩.
واتە :. ئەو زاتە چاکترین و دادپەروەرترینی دادوەرانە.
وە جگە لەم هەموو کوفر و شیرکانە ڕێگری دەکەن بۆ بانگخوازی بۆ ڕێگای تەوحید ئەوکەسانەش کە بەڕاستگۆیی بانگەوازی تەوحید دەکەن دەیانترسێنن بەکوشتن و زیندانی کردن بەڵام نازانن کە ئەهلی تەوحید بێجگە لە الله تعالى لەهیچ کەس و لایەنێک ناترسن.
هەرچەندە باسی کارو کردەوە پیسەکانیان بکەین هەرگیز تەواو نابێ لە [ دژایەتی ئیسلام ـ دژایەتی قورئان ـ دژایەتی ئەهلی حەق ـ دژایەتی موجاهیدان ـ گاڵتە کردن بەحوکمی الله تعالى ـ گاڵتە کردن بەسوننەتی رسول الله (ﷺ) ـ گاڵتەکردن بەهاوەڵان ـ سوکایەتی کردن بە بانگخوازانی ئەهلی تەوحید ـ زیادکردنی شوێنی ( زینا ـ مەی خواردن ـ قومارکردن ) ....... هتد ].
وە ئەمانە ئەو هەموو کوفر و شرکەیان هەیە بۆیە ( ڕۆژوو و نوێژ و زەکات و حەج ....هتد ) لێیان قبوڵ نییە بەڵکو گشت کردەوەکانیان هەڵدەوەشێتەوە بەبەڵگەی ئەم ئایەتە کە الله تعالى ئەفەرموێ : (وَلَقَدۡ أُوحِيَ إِلَيۡكَ وَإِلَى ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِكَ لَئِنۡ أَشۡرَكۡتَ لَيَحۡبَطَنَّ عَمَلُكَ وَلَتَكُونَنَّ مِنَ ٱلۡخَٰسِرِينَ) سورة الزمر ٦٥

واته : سوێند بە الله بادڵنیابن کە وەحی و نیگا نێردراوە بۆ تۆو بۆ ئەوانەی پێش تۆش: ئەگەر هاوەڵگەر بیت و شەریک بۆ الله بڕیار بدەیت کاروکردەوە چاکەکانیشت پووچەڵ دەبێتەوە و دەچیتە ڕیزی خەسارەتمەندو زەرەرمەندانەوە لێرەدا الله تعالی بە پێغەمبەری ئەزیزمان (ﷺ) ئەمە دەفەرموێ چ جای ئێمە ؟!

وە الله تعالی دەفەرموێ : {وَلَوْ أَشْرَكُوا لَحَبِطَ عَنْهُم مَّا كَانُوا يَعْمَلُونَ } الأنعام ٨٨.

خۆ ئەگەر شەریک و هاوبەش بڕیار بدەن، ئەوە هەرچی کارو کردەوەیەکی (چاکیشیان) هەیە هەمووی پووچەڵ دەبێتەوە و بێ نرخ دەبێت.

بۆیە ئەمانە هەرچی کار و کردەوەی چاک بکەن ئەوا پوچەڵ دەبێتەوە و لێیان قبوڵ ناکرێ چونکە کوفر و شیرکیان ئەنجام داوە.

ئەوەی پێویستە لەسەر کەسی مسوڵمان ئەوەی بەخۆی دەڵێت مسوڵمان ئەبێ تەکفیریان بکات و گوێڕایەڵیان نەکات وە ڕق و کینەشی هەبێ بەرامبەریان ئەگینا وەک ئەوان حسابی بۆ دەکرێ وەک الله تعالی ئەفەرموو : (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَتَّخِذُوا الْيَهُودَ وَالنَّصَارَىٰ أَوْلِيَاءَ ۘ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَاءُ بَعْضٍ ۚ وَمَن يَتَوَلَّهُم مِّنكُمْ فَإِنَّهُ مِنْهُمْ ۗ إِنَّ اللَّهَ لَا يَهْدِي الْقَوْمَ الظَّالِمِينَ)المائدة - ٥١

واتە : ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە جولەکەو گاور مەکەنە یارو یاوەرو پشتیوانی خۆتان ئەوانە هەندێکیان پشتیوان و پشتگیری یەکترن، ئەو کەسەی پشت بەوان ببەستێت، ئەوە هەر لەوانە و (حسابی ئەوانی بۆ دەکرێت) بەڕاستی الله هیدایەتی قەومی ستەمکار نادات.

وە الله تعالی ئەفەرموێ : (يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَتَّخِذُواْ ٱلْكَـٰفِرِينَ أَوْلِيَآءَ مِن دُونِ ٱلْمُؤْمِنِينَ ۚ أَتُرِيدُونَ أَن تَجْعَلُواْ لِلَّهِ عَلَيْكُمْ سُلْطَـٰنًا مُّبِينًا)[سورة النساء ١٤٤]

واتە : ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە بێجگە لەمسوڵمانان خەڵکانی بێ باوەڕ بەدۆست و پشتیوانی خۆمەگرن ، ئاخۆ ئەتانەوێ بەڵگەیەکی ئاشکرا دژی خۆتان دەربارەی دووڕوویتان بدەنە دەستی الله . بۆیە ئەبێ رق و کینەمان بەرامبەریان هەبێ تا وەک ئەوان حسابمان بۆنەکرێ.

**2ـ حزبه بەناو ئیسلامیەکان : وەک [ کۆمەڵ ـ یەکگرتوو ـ بزوتنەوەی ئیسلامی و جگە لەمانەش کە هیچ جیاوازیەکی نییە لەگەڵ علمانییەکان تەنیا ئەوە نەبێت ناوی خۆیان ناوە ئیسلامی تاوەکو خەڵکی پێ هەڵبخەڵەتێنن . ئەمانە باوەڕیان بەدەنگدانی کافران و ڕاگەیاندن و هاوکاری هەیە . ئەمانە هەمووی کوفرە ئەوەی کافری نەکات خۆشی کافر ئەبێ.**

**ئەم حزبە بەناو ئیسلامیانە باوەڕیان بەپەرلەمانە لەکاتێکدا کە حوکم بە حوکمی الله ناکات و گاڵتە بەحوکمی الله دەکات وە هەرکەسێ گاڵتە بەحوکمی الله بکات ئەوا کافرە . وەک الله تعالی ئەفەرموێ :ــ (قُلْ أَبِاللَّهِ وَءَايَـٰتِهِۦ وَرَسُولِهِۦ كُنتُمْ تَسْتَهْزِءُونَ (٦٥)لَا تَعْتَذِرُواْ قَدْ كَفَرْتُم بَعْدَ إِيمَـٰنِكُمْ(٦٦)) [سورة التوبة]**

**واتە : پێیان بڵێ ئایە گاڵتەتان بە الله و ئایەتەکانی و بەپێغەمبەرەکەی کردبوو؟ (واتە هەر وشەیەکی کوفر و ناشرین لەدەم بێتە دەرەوە ئەوا بێگومان مرۆڤ پێی کافر دەبێ)**

**بڵێ بیانوو مەهێننەوە چونکە پاش ئەوەی باوەڕتان هێنا کافر بوونەوە.**

**لێرەدا ئەمانە دەڵێن ئێمە بۆ پەیڕەو کردنی حوکمی قورئان چوینەتە پەرلەمان وادەزانن بەو شێوەیە خەڵک هەڵدەخەڵەتێنن بەڵام ئەوانە خۆیان هەڵدەخەڵەتێنن بەڵام هەستی پێناکەن. الله تعالی لەوەسفی ئەوانە دەفەرموێ :**

**(يُخَادِعُونَ اللَّهَ وَالَّذِينَ آمَنُوا وَمَا يَخْدَعُونَ إِلَّا أَنفُسَهُمْ وَمَا يَشْعُرُونَ (٩)فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٌ فَزَادَهُمُ اللَّهُ مَرَضًاۖ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ بِمَا كَانُوا يَكْذِبُونَ) البقرة 10.**

**واتە : ئەوانە بەنیازی خۆیان دەیانەوێ فێڵ و تەڵەکە لەگەڵ الله و ئەوکەسانەدا بکەن کە بڕوایان هێناوە بەڵام لەڕاستیدا تەنها لەگەڵ خۆیان فێڵ و فەرەج دەکەن و زیانەکشیــ هەر بۆخۆیان دەگەڕێتەوە و خۆیان دەخەڵەتێنن لەحاڵێکدا کەهەستیش بەو ڕاستیە ناکەن ، چونکە دڵیان دەرد و نەخۆشی و حەسوودی و گومان و ناپاکی تێدایە جا خوایش ڕۆژ لەدوای ڕۆژ دەردەکەیان زیاد دەکات.**

جــگە لەوەش سزایەکی ســەخت و ئــێش پێگەیەنەریــان بــۆ هەیە لەبەر ئەوەی کەدرۆیـان کـرد بەتـایبەت ئەو دەمەی کەدەیـان وت بڕوامـان بەاللە و ڕۆژی دوایی هەیە.
ئەوانەش دەڵێن باوەڕمان بە اللە هەیە کەچی لەولاوە باوەڕیان بە پەرلەمانێکە کە حوکمی اللە پەیڕەو ناکات بەڵکو گاڵتەشی پێدەکات.
بۆیە تکایە هەڵمەخەڵەتێن بەقسەکانیان کاتێ دەڵێن : (بۆپەیڕەوی قورئان دەچینە پەرلەمان) چونکە ئەمانە درۆ دەکەن ، بەم نموونەیە ڕوونی دەکەینەوە :.
{ بـۆ نمـونە یەکێک لەئەنـدامەکانی حـزبی ئیسـلامی داوایەک پێشـکەش دەکات وەمەبەسـتی ئەوەبـوو کەپەیـڕەوی یەکێـک لەحوکمەکـانی اللە بکـات بەبێ شـک و گومـان ئەو داوایە دەباتە بەردەم ئەنجـومەنی پەرلەمـان پاشـان مناقشـە و تحقـیقی لەسـەر دەکرێ لەئەنجامی دواییش یان ئەوەتا ڕەت دەکرێتەوە یان قبوڵ دەکرێ لەسەر بنەمای زۆرینە ئەگەر هاتوو حوکمەکە ڕەت بکرێتەوە ئەوا بۆی نییە جارێکی دی ئەو داوایە پێشکەش بکات ، وەیەکێ لەوانە کەدەبێ لەکاتی گفتوگۆی پەرلەمان دەبێ ئەنجـامی بـدەی ئەوەیە کەنـابێ بێ پـرسی سـەرۆک قسـە بکەیـت لەمـاددەی (٥٦)ی پەرلەمـان ئەڵێ : { ئەنـدام قسـەکانی ڕووبەڕووی سـەرۆک دەکات و وتەبێژ لەشـوێنی خـۆی ڕادەوەسـتێ یـان لەسـەر ئەو سـەکۆیەی کەلەوێ ئامـادە کـراوە ، لەخاڵی دووەمی هەمان ماددە دەڵێ : نابێ بگەرێتەوە بۆ گفتوگۆکردنی ئەو بابەتانەی کە یەکلایی کراونەتەوە }
چ کوفرێـک لەوە گەورەتـر هەیە کە ئەحکـامی رب العـالمین بخـرێتە ژێـر دەسـتی مرۆڤێک کە بەهەوەسی خۆی بڕیار لەسەر بدات ئەوکەسەی کە قبوڵی بکات یان ڕەتی بکـات ئەوا هەر کـوفرە و خـاوەنەکەی پـێی کـافر ئەبێ ( واتە ئەو داوایەی کە بـردیە ژێـر دەسـتی گەر جێبەجـێش بکرێ ئەوا هەر کافرە ، چـونکە حـوکمی اللە ی خستۆتە ژێر دەستی مرۆڤێک هەتا اختیاری تێدا بکات.

الله تعالى ئەفەرموێ : (وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ وَلَا مُؤْمِنَةٍ إِذَا قَضَى اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَمْرًا أَن يَكُونَ لَهُمُ الْخِيَرَةُ مِنْ أَمْرِهِمْ ۗ وَمَن يَعْصِ اللَّهَ وَرَسُولَهُ فَقَدْ ضَلَّ ضَلَالًا مُّبِينًا)[الأحزاب - ٣٦]

واته : بۆ هیچ پیاوێکی ئیماندار یان ژنێکی ئیماندار، نیە کاتێک کە الله و پێغەمبەرەکەی بڕیاری شتێک بدەن ئەوان سەرپشک بن ( اختیاری تێدا بکەن ) (لە ئەنجامدانی ئەو کارە، چونکە) ئەوەی سەرپێچی بکات لە فەرمانی الله و پێغەمبەرەکەی ئەوە ئیتر بە ئاشکرا گومڕاو سەرلێشێواوە.

وە هەروەها ئەگەر ئەو کەسەی کە حوکمەکەی لەبەر دەست دادەنێ ئەگەر قسەش بکات و جوێن بدات ئەوا بۆت نییە قسە بکەیت چونکە لەماددەی (٢٦) دەڵێ : {ئەندام لەکاتی لێدوان لەسەر ڕادەربڕین و ئەو ڕووداوانەی کە لە کاتی بەدیهێنانی ئەرکەکانی لەئەنجومەنی پەرلەماندا لێیان دەدوێت ئەوا لێی ناپرسرێتەوە}، واتە: بۆت نییە قسە بکەی ئەگەر قسە یان جوێن و گاڵتە بەحوکمی الله بکەن . وەئەمەش بێگومان کوفرە ، حوکم لەغیری قورئان شکی تێدا نییە کە جاهیلیەتە.
بۆیە بەڕێزان نابێ بەقسەکانیان هەبخەڵەتێین و خۆشمان بوێ و هاوکاری و پشتیوانیان بکەین بەڵکو دەبێ تەکفیریان بکەین چونکە باوەڕیان بەپەرلەمانێکە کە حوکم دەردەکات لەغیری حوکمی الله تعالى وەچەندین کوفری تر.
بۆیە گەر کەسێک حەقی بوێت و بەدوای حەق بگەڕێ ئەوا ئەم نمونەیە بەسە بۆ کافربونیان . والله المستعان

**3- مەلا دین فرۆشەکان : هەموو ئەو جۆرە مەلایانە دەگرێتەوە کە لەژێر سایەی حزبە علمانیەکان و بەناو ئیسلامیەکاندا کار دەکەن و وتارەکانیان بەئارەزووی ئەوان پێشکەش دەکەن بێ ئەوەی گوێ بە ڕازی کردنی الله بدەن. بەڵکو ئامانجیان ئەوەیە سەرۆکی علمانی و بەناو ئیسلامیەکان ڕازی بکەن. ئەمانە دونیا ویستن تەنیا بۆ مەرامێکی دونیایی ، ژیانی هەتا هەتاییان لەبیر کردووە کە بریتیە لە (قیامەت ).**
**ئەمانە سەر لەخەڵک ئەشێوێنن و سەریان لێ تێکدەدەن وە باطل بەحەق دەناسێن و حەقیش بە باطل دەناسێنن تەنیا لەپێناو حزبەکانیان . مەترسی ئەو پێشەواو ڕابەرە گومڕایانە لەم بەڵگانە روون دەبێتەوە :.**

**1. عن عبدالله بن عمرو (رضي الله عنه) قال :. سمعت رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قال: إِنَّ اللَّهَ لَا يَقْبِضُ الْعِلْمَ انْتِزَاعًا يَنْتَزِعُهُ مِنْ الْعِبَادِ وَلَكِنْ يَقْبِضُ الْعِلْمَ بِقَبْضِ الْعُلَمَاءِ حَتَّى إِذَا لَمْ يُبْقِ عَالِمًا اتَّخَذَ النَّاسُ رُءُوسًا جُهَّالًا فَسُئِلُوا فَأَفْتَوْا بِغَيْرِ عِلْمٍ فَضَلُّوا وَأَضَلُّوا . رواه البخاري.**

**واته : عبدالله بن عمرو (رضي الله عنه) ئەفەرموێ : گوێم لە رسول اللهﷺ بوو فەرمووی : رب العالمین زانست وەرناگرێتەوە بەوەی لە بەندەکانی وەری بگرێتەوە بەڵکو زانست وەردەگرێتەوە بەوەی کە زانایان و ئەهلی علم دەمرێنێ و دەگەڕێنێتەوە بەجۆرێک عالم نامێنێ هەرکاتێکیش عالم نەما ئەوسا خەڵکی کۆمەڵێک سەری نەزان ئەکەنە سەرۆك و ئەم سەرە نەزانانە پرسیاریان لێدەکرێت و ئەوانیش فتوا ئەدەن بەبێ علم، خەڵک گومڕا ئەکەن و خۆشیان گومڕا ئەکەن.**
**دەبینین لەئێستادا ئەم پێشەوا گومڕاکەرانە زۆرن وە زۆرێکن کە بێ ئاگان لە علم بەتایبەتی علمی تەوحید کە أشرف العلوم ە بۆیە تەوحید بناغەی ئەم ئاینە پیرۆزەییە زۆرێک سەر لەخەڵکی تێکدەدەن و خەڵکی گومڕا دەکەن.**
**لەفەرموودەیەکی تر رسول الله بەشێوەیەکی تر ئەمانترسێنێ :.**

2- عن علي بن أبي طالب (رضي الله عنه) قال: كنا عند النبي ﷺ جلوساً وهو نائم فذكرنا الدجال فاستيقظ محمراً وجهه فقال: غير الدجال أخوف عليكم عندي من الدجال: أئمةٌ مضلون). { في المصنف لابن أبي شيبة }

واته : له علي كوری أبي طالب (رضي الله عنه) دەفەرموێ : ئێمە لەخزمەت رسول الله (ﷺ) دانیشتبووین وە رسول الله ش خەوتبوو ئێمە کەوتینە باس کردنی دەجال وە رسول الله هەستا لەخەو دەم و چاوی سوور هەڵگەڕا بوو پاشان فەرمووی : بێجگە لەدەجال ئەوەی زیاتر لێی دەترسم بۆتان بریتییە لە کۆمەڵێک پێشەواو و ڕابەری گومڕاکەری سەر لێ تێکدەر . لەکاتێکدا رسول الله (ﷺ) دەفەرموێ هیچ فیتنەیەک لەفیتنەی دەجال گەورەتر نییە.

- لێرەدا بۆمان دەرکەوت کە فیتنەیەک لەدەجال مەترسیدارتر بێ بۆمان پێشەوای گومڕاکەرە کە حەق بەباطل ئەناسێنن و باطلیش بەحەق دەناسێنن لەپێناو مەرامێک و ویستێکی شەخصی یان حزبی.

3- قال رسول الله (ﷺ) : {{ إِنَّ أَخْوَفَ مَا أَخَافُ عَلَى أُمَّتِي الْأَئِمَّةُ الْمُضِلِّينَ }} [ الآحاد والمثاني لابن أبي عاصم وهو حديث صحيح ]

واته : رسول الله (ﷺ) دەفەرموێ : مەترسیدارترین شت کە بۆ ئومەتەکەم لێی بترسم کۆمەڵێک پێشەواو ڕابەری گومڕاکەر و سەر لێ تێکدەرە.

- زۆرێک دەبینین لەمەلاکان دەزانن ئەمە حەقە بەڵام دەیشارنەوە و دەڵێن کاتی نییە و گونجاو نییە ئێمەش دەڵێین : باشە تۆ کاتت نییە جێبەجێ بکەیت بەڵام ناکرێ تەنیا لەبەرئەوەی خۆت ئەنجامی نادەیت بە باطل پیشانی خەڵکی بدەیت . یاخود بەپێچەوانەوە تەنیا لەبەر ئەوەی کەخۆت ئەنجامی دەدەیت گەر باطلیش بێ بەحق پیشانی بدەیت تەنیا لەبەر خاتری حزبەکەت یان سەرۆکەکەت.

بۆیە دەبێ زۆر ئاگاداری ئەم مەلا دین فرۆشانە بین هەرگیزاو هەرگیز گوێڕایەڵیان نەکەین تەنیا ئەوانە نەبێت کە تەوحیدیان وەک خۆیان گەیاندووە .والله المستعان

# باسی دووەم | تێکشکاندنی ئاستەنگیەکان

بەڕێزان ئێمە دەتوانین هەموو ئەو ئاستەنگیانەی کەباسمان کرد تێکیان بشکێنین و نەیانهێڵین لەبەردەم ڕێگای تەوحید ئەمەش بەئەنجامدانی سێ کاری زۆر گرینگ جێبەجێ دەبێ :.

- یەکەم / فێربووای زانستی تەوحید : کە گرینگترین زانستە چونکە ئەم زانستە وات لێدەکات بەرەو ڕێگای حەق بچین و هیچ کەسێکی گومڕاکەر و سەر لێتێکدەر ناتوانێ کارت لێبکات وە بەفێربوونی ئەم زانستە دەتوانی ڕەدی گومان و شوبهەکانیان بدەیتەوە وە کارکردن بەم زانستە ڕووناکەرەوەی گۆڕی تاریکە.

- دووەم / بڵاوکردنەوەی زانستی تەوحید : کاتێ کەخۆت لەم زانستە شارەزا بوویت ئەوا هەوڵی زۆر بدە کە خەڵکیش فێر بکەیت چونکە بەرپرسیاری لەو علمەی کە فێربوویت بەڵام نەتگەیاندووە ، بویە پێویستە بیگەیەنین بەو شێوەی کە هەیە [إن هذا العلم هو لحمك ودمك وعنه تسأل يوم القيامة فانظر عمن تأخذه] {مالك بن أنس "الكفاية"٢١ }

لێرەدا دوو شت روون دەبێتەوە :.

1- ئەو زانستەی کەوەری دەگریت وەکو گۆشت و خوێن دەربارەی لێت دەپرسرێتەوە.

2. دەبێ بزانین کەوا لەکێ ئەم زانستە وەردەگری.

- سـێیەم / نەترسـان : واتە نەترسـان لەبـڵاو کـردنەوەی ئەم زانسـتە پـیرۆزە هەرچەندە بکەویتە ژێر هەڕەشە و ئازار چونکە ڕەزامەندی الله زۆر لەوە گەورەترە دوایش ئەگەر ( هەڕەشـە ـ ئازار ـ زیندان ..... هتد ) هەموو ئەمانە ڕووبدات ئەوا بزانە هەر کۆتایی پێ دێت چونکە لەدونیاییە.

باشـە ئازارێـک لەدونیـایەکی کـاتی بچـێژی باشـترە کە کۆتـایی پێ دێـت یـان ئازارێـک لەقیامەتێک کەهەرگیزاو هەرگیز کۆتایی نایێ چونکە قیامەت مردنی تێدا نییە؟؟!
بـۆیە بـا بەچـاو نەترسـانە ڕووبەڕووی ئەم کـافرانە ببیـنەوە بەم زانسـتە پـیرۆزە . وەپێیان بڵێین کە ئێمە بێجگە لە الله تعالى لەهیچ کەس و لایەنێک ناترسین.

........................................................................

بەفەزڵ و منەتی الله تعالى تەواو بووین لەنوسینی ئەم کتێبە ،
داواکارم لە الله تعالى لەکەم و کورتیەکانمان ببوری وە ئەم
کارەمان بەنیەتێکی پاک لێمان وەرگری وە پارێزراومان
بکات لە ڕیا و ویستنی ناوبانگ.
اللهم آمین یارب العالمین
وصلی الله علی محمد وعلی آله وصحبه أجمعین

# پێرستی بابەتەکان